زنجیرەی گەنجانی ئیسلام 7

بەراوردێک لە نێوان

# ئیسلامی حەقیقی و ئەمریکی

نوسینی : مامۆستا ئازادی ڕزگاری



# بەراودێك

## لە نێوان ئیسلامی حەقیقی و ئەمریکی

نووسینی: مامۆستا ئازادی ڕزگاری



بسم اللّه الرحمن الرحيم

الحمدللهَّ الذي أعز من أطاعه واتقاه، وأذل من خالفه وعصاه، مكّن لمن نصر دينه ووالاه، وقهر من حارب شرعه وعاداه، وأشهد أن لا إله إلا اللهَّ، لا معبود لنا غيره، ولا رب لنا سواه، وأشهد أن محمد بن عبد الله نبيه ومجتباه وخليله ومصطفاه، بلغ الرسالة وأدى الأمانة وجاهد في اللهَّ حق جهاده حتى توفاه اللهَّ. صلى اللهَّ وسلم عليه وعلى آله وصحبه ومن اقتفى أثره وسلك منهجه واتبع هداه.

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و میهرەبان کە بەرنامەی ئیسلامی وەکو کەتەلۆکێك بۆ چۆنیەتی رێکخستنی ژیانمانی بۆ ناردووە، سەلام و رەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە برِژێ بەسەر شانازی بونەوەرەوە کە یەکەم مەشخەڵ بەدەستی کاروانی رێی رزگاری مرۆڤایەتییە..

## ئیسلام تەسلیم بوونێکی ڕەهایە بۆ خوای باڵادەست:

ئیسلام: واتە: أَسْلَمَ تەسلیم بوون و خۆ بەدەستەوەدان و ملکەچ بوونی تەواو بۆ الله تعالی و بەرنامەکەی.

یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی ئەم دینە ئەوەیە کە دوو لایەنی و سێ لایەنی قبوڵ ناکات، لە سەدا ٩٩ بۆ الله بێت یان لەسەدا ٩٩ بەرنامەکەت قبوڵ بێت لەسەدا ١ بۆ کەسێک و شتێکی تر بێت یان بەدوای بەرنامە و یاسایەکی غەیری ئیسلام بکەویت و قبوڵت بێت، ئەوا ئیسلام لێت قبوڵناکات و ئەو سەدا ٩٩ دەبێتە پوش و پەڵاش قیمەتی هیچی نیە لای خوای گەورە.

لەسەدا ٩٩ بەرنامەکە جێبەجێ بکەیت و لەسەدا ١ نەکەیت

کافر دەبیت، بۆیە ئیسلام دینی حەنیفە و پاک و پێگەردە و بۆ غەیری خۆی بە مسقاڵی قبوڵ نیە..

بەڵگەکان:

الله تعالى دەفەرموێت: (أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ) (آل عمران:٨٣)

واتە: ئایا ئەوانە بێجگە لە ئاینی خوای گەورە ئاینێکی تریان دەوێت؟! لەکاتێکدا کە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە بە ڕەزامەندی بێت یان بەناچاریی تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارن، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

وه ده‌فه‌رموێت: (بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ) (البقرة:١١٢).

نه‌خێر وانی یه‌، هه‌رکه‌س به‌ڕاستی خۆی بداته‌ ده‌ست خواو له‌هه‌مان کاتدا چاکه‌کارو موسوڵمان بێت، ئه‌وه‌ پاداشتی خۆی لای په‌روه‌ردگاری ده‌ست ده‌که‌وێت و نه‌ترسیان ده‌بێت و نه‌غه‌م و په‌ژاره‌ دایان ده‌گرێت.

وه ده‌فه‌رموێت: (فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَداً)(الجن: ١٤)

واته: جا ئه‌وه‌ی موسوڵمان و ته‌سلیمی خوای گه‌وره‌ ده‌بێت دیاره‌ که‌ ڕێبازی سه‌ر فرازی دۆزیوه‌ته‌وه‌.

وه دەفەرمویێت: (إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) (البقرة:١٣١)

واته: كاتێك پەروەردگاری پێی وت: ملكەچ و فەرمانبەردار بە، (ئەویش خێرا) وتی: تەسلیمی پەروەردگاری هەموو جیهان بووم (باوەڕی پتەوم پێی هەیە).

وه دەفەرمویێت: (فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ)(آل عمران: ٢٠)

واته: خۆ ئەگەر موجادەلە و گفتوگۆی سەختیان لەگەڵدا كردیت، ئەی محمد ﷺ تۆس بڵێ: من و ئەوانەی كە شوێنم كەوتوون ڕوومان كردۆتە خواو تەنها ملكەچی ئەوین.

وه لەسەر زمانی شاژنی سبأ دەفەرموێت: (قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)(النمل: ٤٤)

واتە: وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی تا ئێستا ستەمم لە خۆم کردووە، ئیتر وا لەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بووم.

هەموو ئایەتەکان دەیسەلمێنن کە تەنها و تەنها هەمووشتێك دەبێت بە ملکەچی بۆ خوای گەورە بێت.

بۆیە ئیسلام تەسلیم بوونە بەخوای گەورە و وەرگرتنی هەموو بریارەکانیەتی، وە ملکەچ کردنێکی تەواوە بۆ خوای گەورە، وە بەجێهێنانی بەندایەتیەکی سەرڕاستانەیە بۆ گەورەیی و بەرزی خوای گەورە، بۆیە دەی پەرستین لەبەر ئەوەی تەنها ئەو شایانی پەرستنە و ئێمەشی بۆ پەرستنی خۆی دروستکرووە، خوای

گەورەش ئەفەرموێ: {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} الذاريات:٥٦ واتا: مرۆڤ و پەریم تەنها بۆ بەندایەتی دروست کردووە.

هەموو پێغەمبەرانیش علیهم السلام فەرمانیان بەگەلی خۆیان کردووە کە بەندایەتی تەنها بۆ خوای گەورە بکەن، و هاوەڵ بۆ خوای گەورە دانەنێن و بە یەکتایی بیپەرستن.

وەکو خوای گەورە ئەفەرموێ: {وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ} الأنبياء:٢٥ واتا: هەر پێغەمبەرێکمان دوای تۆ ناردبێ ئیلا سروشی بۆ کراوە کەوا هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیە جگە لە من و بەندایەتیم بۆ بکەن.

بۆیە ئامانجی هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت ئەوەبووە کە شوێنکەوتوانیان موسڵمانی خوایی بن، لێبراو و دڵسۆز بن بۆ

خوا هەر وەکو خوای گەورە ئەفەرموێ: {مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَاداً لِّي مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ} آل عمران: ٧٩ بۆ هیچ مرۆڤێك نەبووە كە خوای گەورە پەیام و حوكم پێغەمبەرایەتی پێ دابێت و پاشان وتبێتی بەخەڵك جگە لە بەندایەتی بۆ خوا ببنە بەندەی من بەڵكو (فەرموویانە) ببنە خوایی و بەوەی كە فێری دەبن لە پەیامیی خواییی و لەوەی ئەیخوێنن.

وە بەوەش كە خوای گەورە هەموو دروستكراوەكانی دروستكردووە، بە مەبەستی ئەوەی ببنە موسڵمانێكی ملكەچ لە بەندایەتیدا بۆ خۆی، وەكو خوای گەوەرە دەفەرموێت: {إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً} مریم٩٣

واته: بەراستی ئەوەی لە ناو ئاسمانەکان و زەوی دایە هەموو وەکو بەندە بۆ خوای گەورەو بەخشندە دێن.

هەموو ئەوەش لە نێوان ئاسمانەکان و زەوی دایە ملکەچە بۆخوای گەورە، یادو ناوی خوا بەرزو پیرۆز ڕائەگرن بەشێوەیەك کەئێمەی مرۆڤ بەئاسانی تێیان ناگەین. خوای گەورە ئەفەرموێ: {تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً }الإسراء:٤٤ واتە: حەوت ئاسامانەکان و زەوی و ئەوەی لە ناو (و نێوانیان)دایە هەمووی هەر یاد و ستایش (تەسبیحاتی) ئەو (خوایە) دەکەن، وەهەرچی هەیە (لەم بوونەوەرەدا) پاکی و بێگەردی و (تەسبیحاتی) ئەو (خوایە) دەکەن، بەڵام ئێوە لە (شێوازی) تەسبیحاتەکانیان تێناگەن، بەراستی ئەو بەخشندەو لێخۆش بووە..

## واتاکانی (ئیسلام) لە قورئاندا:

کاتێ دەڕوانینە ئایەتەکانی قورئان لە باسی ئیسلامدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە قورئاندا (ئیسلام) بەسێ واتا هاتووە:

یەکەم: بە مانای ئاین و بەرنامەی هەموو گەردوون:

ئیسلام بەواتای گشتی، وەستاوە لەسەر تەسلیمبونێکی رەها بە خوای پەوەردگار، ئا ئەم واتایەش ئەوە دەردەخات کە ئیسلام ئاین و ڕێبازی هەموو گەردوونە، بەهەر چی دروستکراوە ئاقڵ و بێ ئەقڵەکانیشەوە، تەنانەت بەبێ گیانەکانیشەوە، بە وەی دیارە لە سروشتدا و ئەوەی نادیارە.

بەڵگەی ئەمەشمان فەرمودەی خوای گەورەیە: {أَفَغَيْرَ دِينِ اللّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ }آل عمران:٨٣ واتە: ئایا ئەوانە بێجگە لە ئاین و بەرنامەی خوا (شتێکی تریان) دەوێت.؟!، لە کاتێکدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویە بە ڕەزامەندی بێت یان بە ناچاری ملکەچی ئەون هەر هەمووشیان بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە.

لە میانەی ئایەتەکەی خۆیدا باسی مانای ئیسلام و پێکهاتەکانی کرد، وەڵامێکە بۆ یەهوودی و نەصرانیەکان کە ئەوان نەهاتوونەتە ناو ئیسلام کە دینی خوای گەورەیە.

ئایەتەکە پرسیاریان لێدەکات کە بۆچی نکوڵی لە هاتنە ناو ئیسلام دەکەن..؟ بۆچی ئەویان ناوێت و خۆیانی لێ بیرلێڵ دەکەن ..؟ لەگەڵ ئەوەی کە ئیسلام دینی خوایە، تاکە ئاین و بەرنامەی ژیانە

که خوا پێی ڕازییە، ئەو دینە کە خەڵك ملکەچی خوا ئەکات، ئاماژەکە لێرەیە : {يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً}.

هەواڵ و هۆشیاری دەدات کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویە ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بوون، تەسلیمی فەرمانەکانین و گوێڕایەڵی و بەندایەتی ئەو ئەکەن.

وە هەروەها ناوی وابەستەی (ئیسمی مەوسوڵ) (مَن) بەڵگەیە لەسەر تێکرایی و گشتگیری، کەوابوو هەموو دروستکراوەکان و ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوی لە زەویدا دەگرێتەوە.

جا لەناو ئەم هەموو دروستکراوە کە تەسلیمی فەرمانەکانی خوای گەورە و میهرەبان بوون، هەیانە تەوعەن (طوعاً) :یانی بە هەڵبژاردەو خواست ویستی خۆیان بەندایەتی خوای گەورە

ئەکەن لە هەڵسوکەوتی و ژیانیان بەڕازی بوونی خۆیان وەکو مەلائیکەتەکانی ئاسمان و بەندە بڕواداره چاکەکانی زەوی لە مرۆڤ و پەری.

وەهەروەها هەیانە: کەرهەن( وَکَرْهاً) ئەوانیش بێباوەڕ و لە مرۆڤ و پەری، چونکە ئەوانیش هەر تەسلیمی خوای گەورە بوون لەلایەنە نەویستراوەکانی ژیانیان، ئەوانیش ملکەچی زاتی ئەعزەمن لە دروست و بوون و ژیان و مردنیان، لە هەناسە هەڵکێشانیان، لەڕۆشتنی ساتەکانی تەمەنیان و لە ئەندامەکانی لاشەیان، هیچ مرۆڤێك بەویستی خۆی رەنگ و دەنگ و شەنگ و باڵا و بینین و بیستن ...ی پێنەدراوە و کارکردنی ئەمانە هیچی لە دەستی خۆی نیە ، خوای گەورە بەکاریان دەخات و ئەیان وەستێنێ هەر کاتێك کەخۆی بیەوێ، خوای گەورە رزق و رۆزی ئادەمیزادی دیاری کردووە، و چارەنوس و کاتی مردنی دیاری

کردووه، کاتێك سەرەنجامی(ئەجەل) هات وەفات ئەکات و ڕۆحی ئەکێشرێ.

بێباوەڕان لە مرۆڤ و جن کە قایل نەبوون بە ئیسلام و ملکەچ نەبوون چۆنیەتی بیرکردنەوە و تێروانینیان هەرچیەك بێ ، چی بڵێن و چۆن ببزوێن ، بێ گومان لایەنی هێزپێدەری ئەندامەکان لە دەستی خوای گەورەیە و لەژێر فەرمانی ئەوە بەڵام چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەندامەکانیان لە بیرکردنەوە و گوفتار و ڕەفتاریان لە ژێرویستی خۆیانە (وەکو جوزءی ئیختیاری).

## دووەم: ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەرانە:

مانای دووەمی ئیسلام لە قورئانی پیرۆزدا ئەوەیە کە ئیسلام ئاینی هەموو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لەسەر بێت، لە باپیری مرۆڤایەتیەوە (ئادەم علیە السلام) تا گەورەی مرۆڤایەتی (محمد ﷺ ئەم مانایەش پەیوەستە و هاو واتایە لەگەڵ مانای یەکەم، لەوەی کە ئیسلام: ئاین و بەرنامەی هەموو دروستکراوەکانی خوایە لەم گەردوونە، لە ئەرزو ئاسمانەکان، ئا ئەو دینەیە کە پێغەمبەران (علیهم السلام)ی پێی هاتوون، ئامانجی تەواوی هەموویان ئەوە بووە کە شوێنکەوتەکانیان بە تەنها بۆ خودای تەنها ملکەچ بن، بەهەمان شێوەی ئەو گەردوونەی کە لەناوی دان.

بۆیە دەبێ بزانین پێغەمبەران (علیهم السلام) هەموویان لەسەر یەک دین بوون ئەویش ئیسلام بوو.

وە هەموویان یەک هەڵوێست بوون لەسەر ئەسڵی ئەم دینە ئەویش تەوحیدە، ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەران بووە هەرلە نوح تاکو محمد (علیهم جمیعا صلاة الله والسلامه) هەموویان لەسەر یەک دین بوون بێ جیاوازی وەکو الله تعالی دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ * وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ) (المؤمنون٥٠ :٥١)..

وە لە تەفسیری ابن کثیر مانای (أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً) واتە: ئەی پێغەمبەران هەمووتان دینەکەتان یەک دینە و یەک میلەتە ئە

ویش بانگ کردنی مرۆڤ بۆ پەرستنی الله ی تاک و تەنها بەبێ هاوەڵ و شیریک بۆ دانانی...

وە لە فەرموودەیەکی ڕاستەوە هاتووە کە مسلم  ئەوانی تریش گێراویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الْأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ من عَلَّاتٍ وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ)..

البغوی لە  شەرحی السنة دەڵێت: بەراستی ئەسڵی دینی هەموو پێغەمبەران یەک شتە لەکاتێکدا شەریعەتەکانیان جیابوون، وەکو چۆن ئەو مناڵانەی کە باوکیان یەکە (العلات) بەڵام لە دایکی جیاوازا!..

وه ابن حجر له فتح الباري دا دەڵێت: مانای فەرموودەکە ئەوە یە کە ئەسڵی دینی هەموو پێغەمبەران یەک شتە کە ئەویش تەوحیدە ئەگەر چی شەریعەتەکانیان لەهەندێک بەشدا لێک جیاوازبن.

بۆیە هەموو پێغەمبەران تەنها بۆ ئەو مەبەستە نێردراون کە بانگکردنی خەڵکە بۆ تەوحید و پەرستنی الله ی دروستکەری ئەرز و ئاسمانە بەملکەچی.

له قورئانی پیرۆزیش چەندان ئایات ئەمە جێگیر دەکەن و دڵنیایی زیاتر دەخەنە دڵی بڕوادارەوە و گومان ناهێڵن لەسەر ئەو ڕاستیەی کەوا: ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەرانە و هەموو پێغەمبەرێکیش موسڵمان بووە، وە هەموویان بانگەوازی گەلەکانیان کردووە تا ببن بەموسڵمان و ملکەچ بن بۆ پەروەردگار

وە بڕوادارە شوێنکەوتەکانیشیان ڕاگەیاندووە کەوا هەموویان موسڵمانن.

بۆ وێنە:

ئیبراهیم پێغەمبەر و ڕۆڵەکانی (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان بە ئیسلامەوە هاتوون:

باوکی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام موسڵمانێکی سەر ڕاست و ملکەچ بوو بۆ خوای پەروەردگار بەرنامەی ژیانیشی (واتە:دینەکەی) ئیسلام بووە.

خوای گەورەش دەفەرموێ: {مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيّاً وَلاَ نَصْرَانِيّاً وَلَكِن كَانَ حَنِيفاً مُّسْلِماً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ}ال عمران:{٦٧} واتە:((دیارو ئاشکرایە) کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ

بێت) نە جوولەکە بووە نەگاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردار و موسڵمان بووە لە (لایەنی) موشیرك و هاوەڵگەران نەبووە.

ئەمەش خوای گەورە داوای لێکردووە کە موسڵمان بێـت و ئەویش وەڵامی داوەتەوەو ئیسلامەتی خۆی ڕا گەیاندووە، هەرکەسێکیش وەکو ئەو بێت ئەوا موسڵمانە و ئەگەر نا ناحاڵی و نەزان و بێباوەڕە. خوای گەورەش فەموویەتی:

{وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ{١٣٠} إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ} البقرة: {١٣٠ -١٣١} واتە: {ئایا کێ پشت هەڵدەکات لە دین و میللەتی ئیبراهیم. جگە لەو کەسەی کە خۆی نەفام و گەلۆر بکات، سوێندبێت بێگومان ئێمە ئیبراهیمان هەڵبژاردووە و (کردوومانە بە پێشەوا) لە دونیاو ،

بەراستی لە دوا ڕۆژیشدا لە ڕیزی پیاوچاکانە}.{کاتێك پەروەردگاری پێی فەرموو، ملکەچ (موسڵمان) بە (ئەویش ڕاستەوخۆ) وتی: ملکەچی پەروەردگاری هەموو جیهانیان بووم.

لە کاتی بنیاتنانەوەی کەعبەیا، ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی (سەلامی خوایان لێبێت) لە خوای گەورە پارانەوە کە خوای گەورە خۆیان و ڕۆڵەکانیان بکات بە موسڵمانی ملکەچ بۆ خۆی، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: {وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ{١٢٧} رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ} البقرة:{١٢٨-١٢٧} واتە:( (یادی ئەوکاتە بکەنەوە) کە ئیبراهیم پایەکانی کەعبەی بەرز دەکردەوە لەگەڵ ئیسماعیل دا (و دەیان فەرموو): پەروەردگارا ئەم کارەمان لێوەر بگرە و لە ڕیزی چاکەکانمان

تۆماری بکە، چونکە بەراستی تۆ هەر خۆت بیسەرو زانای ڕەهای)(خودایە هەردوکمان بکە بەموسڵمان و ملکەچی خۆت، لە نەوەکانیشمان ئوممەتی موسڵمان و فەرمان بەردار بۆخۆت فەراهەم بهێنەو چۆنیەتی ڕێبازی بەندایەتیمان فێربکە و نیشانمان بدەوە تەوبەو پەشیمانیمان لێ وەربگرە، بێگومان تۆ هەر خۆت تەوبە وەرگر و میهرەبانیت)

پێغەمبەر یەعقوبیش سەلامی خوای لێبێت ئەو کاتەی لەسەر پێخەفی مەرگا بوو ویستی لە دوای خۆی دڵینابێ لە ئیسلامەتی ڕۆڵەکانی، بۆیە لە سەرەمەرگا وەسیەتی موسڵمانیەتی تامەرگی بۆ کردن وبەوەی پێیانی فەرموو: نەمرن بە موسڵمانیەتی نەبێ!..

خوای گەورەش ئەفەرموێ: {أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاء إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَـهَكَ وَإِلَـهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَـهاً وَاحِداً وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ} البقرة:{١٣٣} واتە: ئايا ئێوەی (ئەی جوولەکە و گاورانێك کە باوەڕ بە موحەممەد (عليه الصلاة والسلام) ناهێنن خۆتان بە شوێن کەوتەی ئیبراهیم و یەعقوب دەزانن) ئامادەی سەرەمەرگی یەعقوب بوون.؟ ئەوکاتەی بە کوڕەکانی وت: دوای مردنی من چی دەپەرستن.؟، هەموویان وتیان: خوای تۆ و باوك و باپیرانت دەپەرستین. کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقن، خوایەکی تاك و تەنهایە و ئێمە موسڵمانین و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەوین.

دینی یوسف پێغەمبەریش علیه السلام هەر ئیسلام بووە، لە خوای گەورەش پاراوەتەوە کە بە موسڵمانی بیمرێنێ وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزا لە سورەتی یوسفدا تۆماری کردووە و دەفەرموێ: (رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّي فِي الدُّنُيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ) {١٠١} واتە: (پەروەردگارا بەراستی (جەنابت) پادشایەتیت پێ بەخشیم و شارەزات کردم لە لێکدانەوەی خەون، (دەسا) ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی تۆگەورەو (پشت و پەناو یارویاوەری)منی لە دنیاو دوارۆژا، (داواکارم و لێت دەپارێمەوە) کە بە موسڵمانێتی بممرێنیت و بمگەێنی بە (کاروانی) پیاوچاکان).

## پیغەمبەرانی نەوەکانی ئیسرائیلیش هەر بە ئیسلامەوە هاتوون:

موسا سەلامی خوای لێبێت داوای لە رۆڵەکانی ئیسرائیل کرد کە پشت بە خوای گەورە ببەستن و ئیسلامەتیەکەیان پاك و چاککەن، خوای گەورەش دەفەرموێ: (وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ) واتە: موساش بە گەلەکەی خۆی وت: ئەی گەلەکەم ئەگەر ئێوە (بەراستی) بڕواتان بە خوا هێناوە ئەواپشت (هەر) بەو ببەستن ئەگەر موسڵمان و ملکەچی (تەواو)ن.

پێغەمبەر سولەیمانیش هەر بە ئیسلامەوە هاتووە ، بانگخوازێك بوو بانگی خەڵکەکەی خۆی و دەورەوبەری دەکرد کە بێنە ناو ئیسلام..

هەربۆیەش نامەیەکی بۆ پاشاکەی سەبەء(خاتوو بەلقسیە) ناردو داوای کرد کە : خۆی و گەلەکەی بێنە ناو ئیسلامو خوای گەورەش هەواڵی لە دەقی ئەو نامە بانگخوازییەی پێداوین و کە دەفەرموێت: (قَالَتْ يَا أَيُّهَا المَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ * إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ )٢٩-٣١ النمل واتە: شاژن دوای ئەوەی نامەکەی بینی و خوێندیەوە وەزیران و راوێژکارانی خۆی کۆکردەوە و وتی: ئەی بەڕێزەکان (ئەوا) من نامەیەکی بەرێزم پێگەشتووە، کە لە لایەن سولەیمانەوەیەو بەناوی خوای گەورە و بەخشندەی میهرەبانەوە (دەست پێدەکات و دەفەرموێت:( خۆتان لەسەرم بە گەورە) و (لووت بەرز) مەزانن و (واز لە پەرستنی مانگ و خۆر و ئەستێرەو.. بێنن) و بەرەو لای من بە موسڵمانیەتی وەرن.

جا دوای گەشتنی نامەکە بە شاژن و خوێندنەوەی بەسەر دەوروبەریدا وەڵامی ئەرێ و کرداری ئەداتەوە و ئەچێتە سەر دین و بەرنامەی پێغەمبەر سولەیمان، وەك خوای گەورەش لە سورەتی نەملا ئەفەرموێت: {قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ{٤٤} واتە: پەروەردگارا بەراستی من (تائێستا) ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە و (وائێستاش) لەگەڵ سولەیمان موسڵمان بووم ملکەچی پەروەدگاری جیهانیان بووم.

(عیساش علیه السلام) داوای لە یارانی کرد کە موسڵمان بن و ببنە پشتیوانانی خودا و ئەوانیش بە هەمان شێوەی سەر راستی شوێنکەوتەی پێغەمبەران وەڵامیان دایەو و موسڵمان بوونی خویان راگەیاند: (فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) واتە: جا کاتێك عیسا لە دڵی چەسپا و هەستی بە

کوفرو (لادانی) ئەوانەکرد وتی: کێ ئەبێتە سەرخەر و پشتیوانم بۆلای خوا.؟، یاوەرەکانیشی (حەواریەکان) وتیان: ئێمە پشتیوانانی خواین و بروامان پێی هێناوە و تۆش شایەتی ئەوەمان بۆ بدە کە ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری خوابووین و موسڵمان بووین.

لە هەموو ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئیسلام بە واتایەکی مێژوویی دوورو درێژو بەردەوام: هەر لە ئادەمەوە کە باوکی مرۆڤایەتیە تا کۆتا پێغەمبەر موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) و هەموو پێغەمبەرێکیش موسڵمان بووە بەرنامەکەی ئیسلام بووە و داوایان لە شوێن کەوتەکانیان کردووە کە موسڵمان و ملکەچی خوای پەروەردگار بن بەروونی دەدرەوشێـتەوە لە دڵی کەسیی بروادارو مرۆڤی خاوەن ئەقڵ و ویژادن دەچەسپێنن. ئەوەش مانای ئەوە ئەگەیەنێ کە ئیسلام ناونیشانی هەموو دین و بەرنامەیەکی ڕاستتە

که پێغەمبەران هێناویەنە لە لایەن خوای گەورەوە و خوای گەورە ناردویەتی و داوای لە خەڵك کردووە کە باوەڕی پێبکەن و ئەمەش شتێکی ئاسانە (بۆ خوا و وەرگرتنی خەڵك) و هیچ جۆرە نامۆییەکی تێدا نیە. لەبەر ئەوەی ئیسلام ملکەچ بوونە بۆ خوای گەورە و چاك گوێڕایەڵی کردنیەتی و ئەمەش ئامانجی هەموو پێغەمبەرێك و مەبەستی هەموو دینە پاکەکانە، کەواتە ئیبراهیم علیه السلام موسڵمان بووە و دینەکەشی ئیسلام بووە، وە یەعقوبیش علیه السلام موسڵمان بووە و دینەکەشی ئیسلام بووە، وە سولەیمانیش علیه السلام موسڵمان بووە و دینەکەشی ئیسلام بووە، وە موساش علیه السلام موسڵمان بووە و دینەکەشی ئیسلام بووە، وە عیساش علیه السلام موسڵمان بووە و دینەکەشی ئیسلام بووە وە شانازی بونەوارنیش موحەممەد ﷺ موسڵمانە و دینەکەی ئەویش هەر ئیسلامە.

## سێیەم: ئیسلام کۆتا دینە کە کۆتا پێغەمبەر محمد ﷺ پێی هاتووە:

ئیسلام بە واتای سێیەمی بەو بەرنامەی ژیانە ئەوترێت کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی کە کۆتا دینە، وە کۆتایش بە هەموو ئاینەکانی پێش خۆی ئەهێنی. گەورە و سەرداریشمان یەکەمی بڕواداران و موسڵمانانە وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِّيَ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكَينَ﴾ الانعام:{١٤} واتە: (ئەی خۆشەویستم) پێیان بڵێ: کەوا من فەرمانم پێکراوە کە یەکەم کەس بم موسڵمان ببم و ملکەچی خوای گەورە ببم و وە هەرگیز نەکەیت بیچتە ڕیزی هاوەڵگەرانەوە.

ئا بەو واتایەش ئیسلام تاکە دین و بەرنامەی تایبەتە کە خوای گەورە قەبوڵی بێت ، وەکو خوای گەورە ئەفەرموێت:

(إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ إِلاَّ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْياً بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللّهِ فَإِنَّ اللّهِ سَرِيعُ الْحِسَابِ )ال عمران{١٩ واتە: بەراستی دین و بەرنامەی پەسەند تەنها ئیسلامە، ئەوانەش کە کتێبە ئاسمانیەکانیان دراوەتێ جیاوازیان نەکەوتۆتە نێوانەوە مەگەر ئەوەی زانستی تەواویان بۆ هاتووە (دەربارەی راستی ئیسلام و موحەممەد ﷺ بەلام ئەوان لە نێو خۆیان (لەم راستیە) لایان داو( پشت گوێیان خست..)، هەر کەسێکیش بێ باوەربێ بە ئایاتەکانی خوای گەورە خێرا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات.

هەر کەسێکیش بروای بەهەر جۆرە بەرنامە و دینێکی تر هەبێت ئەوا لێی وەرناگیرێت و توشی زیانێکی گەورە دەبێ دەبێتە خاوەنی رەنجێکی فەرهادی، خوای گەورەش لەهەمان سورەتدا دەفەرموێ:

{قُلْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ* وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ}

واتە: (ئەی خۆشەویستم ﷺ ئەی باوەڕدار) بڵێ: باوەڕمان هێناوە بە خوای گەورە و بەوەی بۆی ناردوین و بەوەش کە ناردویەتیە سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانیان و بەوەش دراوە بە موساو عیساو (هەموو) پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ئێمەش لە نێوان هیچکامێکیاندا جیاوازی ناکەین و موسڵمان و ملکەچیی خوای گەورەین، جا ئەوەی بێجگە لە ئیسلام پەیڕەوی هەر بەرنامەیەکی تر بکات، لێ ی وەرناگیرێت و لە دوا ڕۆژیشدا لە ڕیزی خەسارەتمەندانە.

## هەڵوەشاندنەوەی دینەکانی تر بە ئیسلام:

بە هاتنی پەیامی ئیسلام هەموو دینەکانی تر لا ئەبرێت و ئەسرێتەوە و هەموویان بە ئیسلام (نەسخ) ئەبنەوە و، هەمووشوێنەکەوتەکانیان لێپرسراون بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە و شوێنکەوتنی پەیامبەرەکەی ﷺ.

یەکەم کەسانێکیش کە ئەو بەرپرسیارەتیەیان بکەوێتە سەر یەهوودو نەصاراکانن، چونکە ئەو ئیسلامەی کە پێغەمبەر موسا (علیه السلام) لەسەری بوو زاناکانی یەهوودی لە خەڵکیان شێواند تاوای لێهات ئەو ئیسلامەتیەیان لێ قەبوڵ نەکرێ، بە هەمان شێوە ئەو ئیسلامەتیەی کە پەیامبەر عیسا (علیه السلام) پێی هات، زاناکانی نەصارا شێواندیان و تاوای لێ هات خوای گەورە ئەویشی هەڵوەشاندەوە.

ئێستاش یەهوود و نەصارا کەوتوونەتە ئەوەی کە ئەبێ بۆ ئیسلام بێن چونکە ئیسلام کۆتاپێهێنەری هەموو دینەکانەو پێویستە شوێنی کوتا پێغەمبەر ﷺ بکەون، جا ئەگەر وەڵامی ئەرێیی کرداریان دایەوە و هاتن بەرەو ئیسلام ئەوا ئەوانیش ئەبن بەموسڵمان و ئەکەونە ریزی پیاوچاکانەوە، ئەگەریش پشتیان هەڵکرد و بەرپەرچیان دایەوە بەدەمیەوە نەهاتن، لەسەر دینی هەڵوەشاوەی خۆیان مانەوە ئەوا ئەبنە بێ باوەڕ و ئەچنە ڕیزی زەرەرمەندان، خوای گەورەش ئەفەرموێت: (فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ)

خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە کەوا بە ئاشکراو بێباکانە لە ڕووی یەهوود و نەصاراکان بڵێ: ئەوا من رووی ملکەچی خۆم بۆخوای خۆم دانا لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە شوێنم کەوتوون.

هەروەك خوای گەورە فەرمانی کردوە کە بە خاوەن کتێب و نەخوێندەوارەکانیش بڵێ: (ئایا موسڵمان بوون.؟) "ئەمەش خستنە روێکی ئاشکرایە بۆ هاتنە ناو ئیسلامەکە" ئەگەر وەڵامی بەڵێ یان دایەوە و بەدەمیەوە هاتن ئەوا لە رێنمویی کراوانن و رێنمویی و رێ رۆشنیش دروست نابێ مەگەر بەهاتنە ناو ئیسلامەوە.. {فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ}

## بانگەوازی شوێن کەوتەکانیان بۆ دەست لەملان بوونی ئیسلام:

دیسانەوە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە و کە بانگهێشتی خاوەن کتێبەکان بکات بۆ وشەی یەکسان، کە بەندایەتی بۆ یەکخواپەرستی ئاشکرا بکەن ئەمەشیان نایەتە جێ مەگەر بەهاتنە ناو ئیسلامەکە نەبێت، خوای تبارك وتعالی ش ئەفەرموێت: (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) ال عمران:٦٤ واتە: (ئەی خۆشەویستم ﷺ پێیان بلێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ رەوانە کراوە، وەرن (بەدەم رێباز و بانگەوازەکەیەوە) کە وشەی یەکسان (و هاوبەش)ە لە نێوانماندا، بەوەی کەواپەرستن تەنها بۆ خوا بکەین و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیارنەدەین و کەسمان ئەوی ترمان نەکات (بە پیرۆز و داوەری

ڕەها) جگە لە خوا، ڕوویان وەرگێرا ئەوا بڵێ : شاهێدبن کەوا ئێمە موسڵمانین.

پێغەمبەریش ﷺ بەو شێوەی کە خوا داوای لێ کردبوو فەرمانەکەی بە جێهێنا بەهەمان شێوەی دەرکەوتنی لە ئایەتە پیرۆزەکەدا و بەڵکو ئایەتەکەشی کرد بە پەیامێکی بانگەوازی و ئاراستەی هیرقڵی نەصرانی ئیمپراتۆری رۆمی کرد، بۆشی روون کردەوە کە ئەگەر نەیەتە ناو ئیسلام ئەوا هەرگیز نابێتە یەکتاپەرست و بڕوادار.

بوخای بە ژمارە (٧) و موسلیمیش بە ژمارە(١٧٧٣) رەحمەتی خوایان لێبیت لە عبدالله  کوری عەبباسەوە رەزای خوایان لێ بێت کەوا: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیامی نوسراوی بۆ هیرقل نارد، تێدا فەرموو بووی: بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە

موحەممەد بەندە و نێردراوی خوا، بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆم،
سەلام لەو کەسەی شوێن ڕێنمویی (خوا) دەکەوێت..

لە پاشاندا: ئەوە من داوات لێدەکەم موسڵمان بە سەلامەت دەبیت، خوای گەورە پاداشتی دوو بەرابەرت دەداتەوە، ئەگەریش ڕووت وەرگێرا و پشتت هەڵکرد، ئەوا تاوانی (ئەریسەکانت"ئەوانەی کە هیرەقل فەرمانداریانی دەکرد") دەکەوێتە ئەستۆ. (يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ).

هەروەها باوکی پێغەمبەران گەورەمان ئیبراهیم علیه السلام، ئێمەی موسڵمانی خۆشدەوێت خۆشی ئەم ناوەی لێناوین.

وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيداً عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ) الحج:٧٨ واتە: (ئەو خوایە) هەڵی بژاردوون و لە دین و بەرنامەکەی ئەودا هیچ جۆرە ئەزیەت و قورسی و نارەحەتییەك نیە (کە پێتان نەکرێ ئەنجامی بدەن) (ئەم دینەش) ڕێ شوێنی باوکتان ئیبراهیمە، کە (ئەو) ناوی ناون موسڵمان..، تا پێغەمبەر ببێ بە شایەت بەسەرتانەوەو ئێوەش ببن بەشاهێد لە سەر خەڵکی یەوە.

خوای گەورەش بە دینێکی گشتگیرو پڕاو پڕ و بەخششێکی تەواو خەڵاتی کردوین و بە ئیسلامیش لێمان ڕازیە وەك ئەفەرموێ:

{الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً} المائدة:٣ واته: ئەمڕۆ (کەڕۆژی عەرەفەیە) بێ بڕواکان بێ ئومێد بوون لە دینەکەتان (هەرگیز ناتوانن نووری خوا بکوژێننەوە) بۆیە هەرگیز لەوان مەترسێن و لەمن بترسن، (ئا ئەمڕۆ بەرنامەکەتانم بۆ کامڵ کردن و نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام بەرنامەی ژیانتان بێت.

ئا ئەمەیە ئیسلام :بە واتا گشتیەکەی، بەرنامەی بێگەردی هەموو گەردوونە، وەهەموو گەردوون ملکەچی خوای گەورەیە، وە بەم واتایە مێژووییەکەی دینی هەموو پێغەمبەرانی پێشوە (علیهم السلام)، وە بە واتا تایبەتیەکەی ڕێگاو ڕێبازی پێغەمبەری ڕزگارکارە کە کۆتایی بە هەموو پەیام و پەیامبەران هێنا. کەواتە پێویستە داوەری تەنها بۆ ئەو ئیسلامە بێت.

## ئیسلامی ئەمریکایی

هۆ کاری گرینگی دانی ئەمریکا بە ئیسلام

ئەمریکا و هاوپەیمان و هاورێیان و هاوڕایان و هاو بیران و هاوبارانی لەم ڕۆژگارە گرنگیەکی زۆر بە ئیسلام دەدەن، ئەوان پێویستیانە کەڕوو بەڕووی شیوعی پێ بکەنەوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست ، پاش ئەوەی گومرابوون لە ڕوو بەڕوو بونەوەی زیاتر لە نۆ سەدە بەدێژایی شەڕی خاچ پەرستان.

ئەوان پێویستیان پێیەتی هەرەوەکو چۆن پێویستیان بە ئەڵمانیاو و یابان و ئیتاڵیا یە، ئەوانەی کە لە جەنگە کانی پێشو تێکیان شکاند، جا ئەمڕۆ بە هەموو شێوازێك دەیانەوێ لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستن و بوەستنەوە لە ڕووی سەر ئێشەی شوعیەت ،

که بێ گومان له بەیانیدا دێنەوە بۆ تێکشکاندنەوە یان جارێکی تر ئەگەر پێ یان کرا.

ئەو ئیسلامەی کە ئەمریکاو هاوبارانیان دەیانەوێ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەو ئیسلامە نیە کەوا بەرەنگاری داگیر کەر دەبێتەوە وە ئەو ئیسلامەش نیە  کە دژ بە تاغوتانە، تەنها ئیسلامێکە کە ڕوو بەڕووی شیوعی ببێتەوە.

ئەوان نایانەوێ ئیسلام حوکم بکات، لەبەر ئەوەی لەو کاتەی ئیسلام حوکم دەکا گەلان گەشەیەکی تر دەکەن، پاش ئەوە گەلان ئەوە دەزانن کە پێکهێنانی هێز و ئامادەباشیان فەڕزە وە پەڕاگەندە کردن و ڕاو نان وقاودانی و دەرکردنی داگیرکەرو کۆلۆنیالیزم لەسەریان فەڕزە و شیوعی و ئەمریکاش دوژمنن و

هیچ جیاوازیەکیان نییەو هەدوو لایان وەك یەك دوژمنی سەرسەختی ئیسلامەکەن!

ئیسلامی ئەمریکایی: ئەمریکاو هاو پەیمانەکانی ڕێگەیان داوە بە هەبوو نی ئیسلامێکی ئەمریکایی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا بۆ ئەوەی مەوج و شەپۆلی ڕەهای ئیسلامیان لە هەموو شوێنێك دەستگیربێ، قسەکردن لەسەر ئیسلام ڕوونە لەمیدیای وولات، لێرەو لەوێ، وە مشتومڕو و چەن و چونی ئاینیەکان بەتەواوی نغرۆی ئەم پەڕاوانە (میدیا)یانە بوون بەجۆرێك کە هیچ زانیاریەکی لەوبارەوە نییە کە ئیسلام چی بۆ چاکە، تەنانەت زانیارییان دەربارەی ئیسلام هەر نییە ، وە ڕۆلی ڕاگەیاندن و بڵاو کردنەوە _کە بێ گومان سەر بە ئەمریکایە _ ئاشکرای دەکات کە پێویستە بۆ ئەو ئیسلامە بابەتی نوسراوی مانگانەی هەبێت،

و له رابردووشدا کتێبی دیاریان بۆ بانگخوازه هاوپەیمانه کانیان هەبووه وه بانگیان دەکەن بۆ نوسین له سەر ئەو ئیسلامه که بایەخێکی زۆریان پێ داوه له پاش ئەو شەڕانەی رابردوو جا له پاش ئەوەی هاوپەیمانانیان سەر کەوتن خۆیانی لێ بێ دەنگ دەکەن ، وه ئەو مەلا و داعییه خۆفرۆشانەی گوێیان بۆ دەگرن و پەیڕەوی کارەکانیان دەکەن، دەیان کەن به خاوەنی سەروەت و سامانی بێ شومار، دیان کەنه خاوەن پلەو پایه، وپێشبڕکەرانی سەر ئیسلام شوعیەت تایبەتن بەوەرگرتنی دیاری گەوره!

## ئیسلام و ئیسلام

بەڵام ئەو ئیسلامەی کە دژایەتی داگیرکەر دەکا _هەر وەکو چۆن دژایەتی شوعیش دەکات_ هیچ لە بارەیانەوە نایەتە باس و دوان ، بەڵێ ئەو ئیسلامەی کە حوکمی ژیان دەکات بە هەموو گۆرانکاریەکانیەوە هیچ لەو کەسە ناکەسانە ئاماژەی بۆناکەن.

راستە حوکمی گەل و چاکەکاری و یەکسانی لە ئیسلام دایەو لە باسیان چەندان کتێب و بابەت هەڵدەگرێ... بەڵام نەك لەسەر پاشخستنی حوکمی ئیسلام ، چونکە حوکم بە ئیسلام یاسادانان لە ئیسلام و سەرکەوتن بۆ ئیسلام بۆ هیچ کەس نی یە قەڵەمی پێدا بێنێ و ڕاست و چەپ بیکەوێتە باسکردنی و لە ناوبردن و لە بیرخستنی!!

دانە پاڵ بۆ ئیسلانی خوایی ئەوە رابواردن و گاڵتە پێکردنە بەڵکو پێویست و ئاتاجە بەڵام سەرکەوتن هەر بۆ ئیسلام شوێن کەوتوانیەتی ئەو شوێنکەوتوو و خۆشەویستانەی تەنها بۆ ئەو کار دەکەن، وە ڕووبەڕووی داگیرکەر و تاغوتان (سنوربەزێنان) و شوعیەتیش دەبنەوە ئەو شوێن کەوتوو خۆشەویستانە ئەوانەن کە ئیسلامیان واناسیوە کە دەبێ حوکم کات تابەرو بوومەکەی بەتەواوی بێتە بەرهەم،بەو جۆرە نین و نایانەوێ ببنە خزمەتکاری تاغوت و داگیرکەران بەڵکو دەیانەوێ بە ئیسلام یەکسانی و داپەروەری و سەربەرزی و رێز وەدەسخەن.

بەڵام ڕۆڵی ڕاگەیاندنی ئیسلام لەم ڕۆژگارەو ڕۆڵی بازرگانی کەرەکان بەدین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئائەمانە کەف لەدەم دەرپەڕیوی لالوتی دڵرەقن، لەو کاتەی ڕێگا درێژ بوون بە خۆیەوە دەبینیێ، بەدڵنیاییەوە ئەم ڕیگایە درێژبوونکی زۆر خێرا

به خۆیەوە دەبینێ، خێراتر لەوەی کە کەسانێك گومانی بۆ دەبەن، ئەوان بە دووری دەبینن بەلام ئێمە بەنزیك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَعَدَ اللّهُ الّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمْ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا) النور:٥٥خوا بەڵێنی بە هەندێك لە ئێوەی بڕوادار داوە کە کاری چاك دەکەن؛ کاروباری زەمینیان پێ بسپێری وەك بە بڕواداارانی پێشوی سپاردوە و ئاینەکەشیان کە خوا پێی ڕازی بووە سەقامگیر دەکات و پاشان ڕەوشی پڕ ترسیشیان بۆ بەڕەوشێکی ئارام دەگۆڕێ و من دەپەرستن و هاوبەشم بۆ پەیدا ناکەن

پوختەی هزری وتار: لەسەر ( ئیسلامی ئەمریکایی ) لەسەر ئەم باتانەی دوایی دواوە:

١ – هۆکاری گرنگی دانی ئەمریکا بە ئیسلام: ئەوەش کە لە پیاوەتی خۆی نییە وە لە خۆشەویستیان نی بۆ ئیسلام ، بەڵکو بۆ بەجێ هێنانی مەبەستی خۆیانە لە داگیرکردنی ناوچەکە.

٢ – ڕوون کردنەوەی ئەو ئیسلامەی ئەمریکا دەیەوێ: ئەویش ئەو ئیسلامە نی یە کە خوای گەورە دایبەزاندووە، بەو تێگەیشتنە گشتی و گشگیرەی خۆی، بەڵکە ئەوە ئیسلامێکە کە دژایەتی دوژمنانی ئەوان دەکات.

٣ – گرتنی شەپۆڵی سەردەم لەگەیاندنی ئیسلام: هەمان ئەو شەوپۆلانەی کە بانگ و بانگەشە و وتاو و بەرنامەی تیادەدرەوشێتەوە، کەبونەتە کۆڵگەی پەڕو پەراو و بڵاو کراوە بەگشتی هۆکاری ئەوەش ئەوە دەست لەسەر سینگبونەیە بۆ نیازی ئەمریکی لە هەڵقۆزینەوەی ئیسلام.

٤ – دەرخستنی هەندێ بابەتی ئیسلامی کە لە ئێستادا باس کردنیان بۆ ئەمریکا سومەندەو جێی دڵخۆشی یە و ئەو بابەتانەی کە بە پێچەوانەوەن.

٥ – ڕونکردنەوەی لیپاو و شەپۆلی گفتو گۆ لەسەر (پاشەناز) زەکات : ئەمەشیان کە وەستانە بەرامبەر شوعیەتە بۆ رەزامەندی ئەمریکا.

٦ – پەردەلادانی پەیوەندی نهێنی نێوان (بازنەی لێکۆلینەوەی کۆمەڵایەتی) لە میسر و ئەمریکا هەمان ئەو چەمەرەیە یە کە بازاڕی ئیسلامی ئەمریکایی گەرم دەکات.

٧ – رونکردنەوەی شیکاری هاوبەشی لە شەپۆلی دەرخستنی ئیسلامی ئەمریکایی لەسەر دەقە ئیسلامیەکان ، وەهەڵسوکەوت کردن لە گەڵیان بەو شێوەی کەئارەزوویانە.

٨ – بانگەشە کردن بۆ پێویستی پابەندبوون بە ئیسلام بەو شێوەیەی کە خوای گەورە دایبەزاندوە، وبازرگانی پیوە نەکردنی، بێ لادان وگۆران بۆ دەقەکانی.

٩ – یادخستنەوەی ئەوەی کەوا ئیسلامی خوایی کۆمەڵێك سەرباز و دڵباز و گیان لەسەر دەستی هەیە، وکەسانی خۆشەویست و دڵسۆزی هەیە، کە بانگەشەی بۆ دەکەن و ڕووبەڕووی دوژمنەکانی دەبنەوە.

١٠ – ئاماژەکردن بۆ هەرەس هێنانی هەموو هەوڵیك بۆ شێواندنی ڕاستیەکانی ئیسلام کە ئەمریکا و هاوبارانی پێی هەڵدەستن.

## شێوازی ئەو ئیسلامە ئەمریکاییە چییە کە ئەمریکا لێی ڕازییە..؟

ئەوە چەیە کە کار و کۆشش دەکا بۆ ئەوەی بیخاتە بەدەرستی موسڵمانان وە بانگیان دەکات بۆ پەیوەست بوون و کار بەو کردنی، تا بۆ پێشهاتی هەر کارێك لە بەرژەوەندی ئەمریکا و یەهود بڕیار بدەن.

ئەی خوو و سیفاتی ئەو بانگخوازو زانا موسڵمانانە چی یە کە سازاون لە گەل ئەمریکای داگیر کەردا..؟

یەهوود و ئەمریکا ئیسلامێکی تایبەتیان دەوێ )کورد دەڵێ ناسکە خەیاری گوڵ بەدەم بێ (بەدەهۆلی ئەوان بکەوێتە سەما، بە چەند شێواز و (مواسەفات)و پێوەرێك کە خۆیان دایان ڕشتووە، گەر وانە بوو ئەوا دەبێتە ئیسلامێکی توندڕەو و تۆقێنەر

و دەرماریگرو تیرۆریست کەپێویستە دژیان بوستینەوە و حوکمیان بەسەر داکەین.

لێرەدا چەند شێواز و بیری ئیسلامی ئەمریکایی دەخەینە ڕوو کە ئەمریکا لێ ی ڕەزایە ئەویش:

١- ئیسلامێکە: کە قسەکانی کورت کردۆتەوە لە سەر دروشمە عیبادەتیەکان وەکو: نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج و یادی خوای گەورە...

٢- ئیسلامێکە: باس و خواسی بەرفراوان کردووە لە بابەت ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ پیشاندانی جۆرەها سزا و چەندەها خۆشی..

٣- ئیسلامێکە: کە بانگەشەی پەروەردەی دەروون ڕەوشت بەرزی دەکا باسو خواسی لەسەر دڵ و نەخۆشیەکانی یەتی..

٤ – ئیسلامێکە: موسڵمانان ئاراستەی خۆشەویستی جولەکەو دیانەکان دەکات، داوای وەرگرتن و هاوکاری کردنیان و رێککەوتن لەگەڵیان دەکات، وە هەموو ئەو زەبر و زبرەیی ئەوان لەسەرمان لا دەبات کە تەنانەت لەدڵیشمان نابێ پێمان ناخۆش بێ!.

٥- ئیسلامێکە: کە تێکەڵاوی پیاو و ئافرەت بە پیرۆز ڕادەگرێ، وە داوای کاری لەگەڵ یەکیان لێ دەکات، ئافرەت لە شوێنی پیاو ڕابوەستێ، دەستیان تێکەڵی یەك بکەن بەناوی خزمەتی وولات و پێشخستنی کۆمەڵگا.

٦- ئیسلامێکە: داوا لە ئافرەت دەکا کە هەڵسێت بە ئەرکی سەرشانی لەئەرکە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا، وگێرانی ڕۆلی خۆی بۆ خزمەتی ووڵات، بەبێ هیچ ئاراستە و مەرج و بیرو بڕوای (هیچ دید و دینێ)، گرنگی نادا بە چۆنیەتی بەجێ هێنانی ئەرك و کاری سەرشانی، جا گرنیگیش نی یە کە چ بەرگێك لەبەردەکا و چ هەڵسوکەوتێك ئەنجام دەدات وەچۆن خۆی پۆشەری ڕووت دەکا ، لەبەر ئەوەی ئەوانە شتی تایبەتین.

٧ – ئیسلامێکە: کە گرینگی بە کارو بوارو بارە دیارە کۆمەڵایەتیەکان دەدات، بانگەشەی خێرخوازی دەکات وەکو سەرپەرشتی بێوەژن و مناڵە بێ باوکەکان یارمەتی دانی هەژار و نەداران.

٨ – ئیسلامێکە: کە جیهادی کورت کردۆتەوە لە جیهادی نەفس و، کوشتاری ئارەزوو دەمارگیری لەگەڵ شەیتان کە وەسوەسەی خراپ مان بۆ دێنێت و فێرمان دەکەن ئەوانەی جیهاد دەکەن تیرۆرست و توندڕەون.

٩ – ئیسلامێکە: بە دژایەتی توندڕەوی و تۆقان زیادەڕۆیی دەکات و تۆقێنەران و (تیرۆرستانیش)ی لەبازنەی خۆی بردۆتە دەرەوە

١٠ – ئیسلامێکە: خوێنرشتن و شەڕی حەڕام کردووە تەنانەت لەگەڵ ئەوانەی کە شەڕیشی لە دژ دەکەن.

١١ – ئیسلامێکە: پێناسە دەکرێ بە گونجان لەگەڵ هەموو دەسەڵاتێك، ئەو ئیسلامە دانی بەگەشە و گۆڕان ناوە ، زۆر ئاسایشە کە چەمکە نەگۆڕەکانی بۆ هەر شتێك بگۆڕێ.

١٢ – ئیسلامێکە: کەسنور و بەربەستی لەنێوان هەموو دینەکان شکاندووە ، بانگەشەی هاوکاری مرۆڤایەتی و ئازادی مرۆڤەکان دەکات.

١٣ – ئیسلامێکە: کەلەگەل یەهوود و نەصارا بەڕێدا دەڕوا، وڕێك کەوتون بەیەکەوە دژایەتی توندڕەوی و توقان بکەن، لەگەڵ ئەوانیش بانگەشەی جیهانێکی بەتاڵ لە توندی و تۆقان (ئیرهاب) دەکات.

١٤ – ئیسلامێکە: بانگەشەی ئاشتی جیهانی و سینە فراوانی مرۆڤایەتی دەکات وە هەموو ئەو دروشمە ئامادەییە ڕۆژئاواییانەی وەرگرتووە کە هەڵساوە بە پێناسە کردنی ئەو ئاشتی و ئەو سینە فراوانیە.

١٥ – ئیسلامێکه: که چۆنیەتی حوکم بەلایەوە گرنگ نی یه ، وه نایەته باسی سیفەتەکانی داوەر (حاکم)، وەدانان و هێنانەوە جێنشین (خەلیفه)، ئەوەی لێگەڕاوه بۆ حاکمەکان که چۆنیان بوێت بیکەن و لێخوڕن.

١٦ – ئیسلامێکه: بەهیچ جۆرێك ناچێته ناو ڕامیاری یی و (سیاسەت)یەوە، یا دارایی و ئابووری وەتەنگ بەهیچ سیاسیەك و پیاوەسەرمایەدارەکان هەڵناچنێ نه به حەڕام نەبه حەڵاڵ.

١٧ – ئیسلامێکە: هەموو بیرو ڕێڕەوە ڕۆژئاواییەکان وەردەگرێ، لەبەر ئەوەی بەرهەمی شێوازێکی ئامادەیە، وەهی عەقڵێکی ڕۆشن و بیرکەرەوە یە، ئەوەیە کە بانگەشەی دیموکراتی دەکات، ئەوە یە کە داوای ئازادی مرۆڤایەتی دەکات، جا لەسەر ئەو دید و بیرەی خۆی لە گەڵ ڕێخراوە جیهانیە نێو دەوڵەتیەکان ڕێك دەکەوێ.

١٨ – ئیسلامێکە: هیچ بار گرژی و دەبەڕێك ڕاچوونی لەگەڵ ئەوەدانی یە کە(دین) لە (دەوڵەت) جیا بکرێتەوە، ڕازیە بەو کەمە بەشەی کەپێی دراوە،با بۆ خۆی لەمزگەوتەکان بمێنێتەوە تا عیبادەتی خۆی بکات، وەناچێتە ناو ژیانی تایبەتی موسڵمانەوە، لە بارو بوارە کۆمەڵایەتیەکانیش لە خۆی نا پێچێتەوە،

١٩ – ئیسلامێکە: ئەو لادان و ڕادان و گەندەڵی و تاوان و بۆگەن و پیسیانە نابینێ، لەبەر ئەوەی ئەوانە شتی بێ مانان، ئازادی داواە بەخەڵك لەو کارانەی کە دەیانەوێ.

٢٠ – ئیسلامێکە: گوێبیستیناڵەی چەوساوان و هاواری ئازاردراوان و ژانی ستەم دیدان نابیستێ، بەڵکو داوایان لێ دەکات کە ئارام بگرن لەسەر ستەم کارانیان، وەناشبێ هیچ هەڵوێستێك وەربگرن و لەقم و ڕەخنە بگرن، چونکە ئەگەر ڕەخنەیان گرت ئەوا دیارە ڕخنەیان لە قەدەری خواگرتووە!..

٢١ – ئیسلامێکه: کەهەموو شتێك لەموسڵمان قەبوڵ دەکا بۆی جا هەرچەندە کەمیش بێ (یاهەر نەبێ)، دووریان ناخاتەوە لە تەمبەڵی و بێ هێزی زەلیلی و کەتەنەفی و ڕسوایی زەبوونی، دوریان ناخاتەوە کە لەگەڵ ئارەزوویان بەڕێدا بڕوا، لەبەر ئەوەی بێ هێزی و نادانی و کۆڵدان لە سروشتی مرۆڤە.

٢٢ – ئەو ئیسلامە هەر لە ڕەسەنایەتی خۆیەوە (خیلافەت)ی سڕیویەتیەوە و لایداوە.

٢٣ – ئیسلامێکە: بەهیچ جۆرێك دان بە بزاوت و بزوتنەوە و لایەن کۆمەڵە ئیسلامیەکان کە کاری سیاسی دەکەن نانێت، ئائەوانەی کە نایەڵن بەرپرسان هەڵەکار بن و ئا ئەوانەی کە داوای دروست بونی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی دەکەن.

٢٤ – ئیسلامێکە: نایەتە باسی ئازادی گەلان، و سەربەخۆیی ویستی سیاسی و، هێزی ئابووری و چاکی بە کارهێنانی شتومەکی کڕاویان،وباشی وولاتیان.

٢٥ – ئیسلامێکە: پێکهاتووە ورێککەوتووە لەگەڵ دوژمنە چاوچنۆك و چاوبرسی و تەماع کارەکان، لە جولەکەو ئەمریکا، واداوای نێوان خۆشکردن و رێککەوتن لەگەڵیان دەکات، وە نابێ موسڵمانان هێرشیان بکەنە سەرو تاقم و لایەنەکانیان چاوپۆشی بکەن لەو پرۆگرام و بەرامە و پیلانەکانیان بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەموو جیهان و جیهانشینان، وە بایەخی قسەی موسلمانان لەسەر ئەوە کە ئەوان کافرن شتێکی نەویستراو و قسەی بەتاڵە!، وە بانگەشەش بۆ کوشتاریان هەڵپەو تەپە و وەرنەگیراوە.

ئائەوە ئیسلامی ئەمریکاییە کە ئەمریکا خۆی لێ ی ڕازیە هەر ئەوەیە کەموسڵمانانی بۆ بانگ دەکەن تا پێیەوە پابەند بن وە کاری پێ بکەن، ئا ئەو ئیسلامە بەتاڵە لە پێکهاتەو تێگەیشتنێکی ڕاست، ئەمە رۆحی زیندوو زیندەبەچاڵ دەکات، پێی ناکرێ ئاراستەو کاریگەری و گۆڕانکاری ئەنجام بدات، ئیسلامێکە نابینێ و نابیستێ و نابزوێ، ئەوە ئیسلام نییە تەنها ناوێکی ڕووتە، ناوێکی مردوو هیچ هۆکارێك نی بۆ ژیانی چ جای بۆ ژێنەر بوونی!!

## خاسیەت و تایبەت مەندی بانگخوازە موسڵمانەکان کە ئەمریکا لێیان رازییە:

پێشتر باسی ئەوەمان کرد لە شیوازی ئیسلامی ئەمریکایی، ئیستاش بۆیاد خستنەوەی پوختەیەك لەو تایبەت مەندیانەی بانگخوازی موسڵمانە شارستانیە ئامادەیەی کە لەخزمەتی ئەمریکا یە و ئەوان لێ ی ڕازین وەداواش دەکەن موسڵمانان بە گشتی هاوشێوەی ئەوان بن جائەمانە خاسیەت و تایبەت مەندی ئەو بانگخوازانەن:

بانگخواز: بێ گومان مەبەستمان هەموو ئەو ئاراستەوانە موسڵمانانە یە کە بانگەشە بۆ ئیسلام دەکەن جا چ لە ناو مەلایان یان ئامۆژگاریکاران... ئێمە وشەی بانگخوازمان بۆیان هەڵبژاردووە:

١ – بانگخوازێکه : که به شێوەی ئیسلامی ئەمریکایی له ئیسلام گەیشتووه ، ئابەو جۆره که له باسی پێشودا وروژاندمان.

٢ – بانگخوازێکه: کەباس و خواس و وتارو گوتاری کورت کردۆتەوه لەسەر بابەته بچوك و بێ ماناکان و (اختلاف) راجیایی زانایان.

٣ – بانگخوازێکه :نوققه ناکا له بابەت سیاسەت و ئابووری، رەخنەش ناگرێ لەو هەڵسوکەوت و کاره خراپانەی که خراپه کاران ئەنجامی دەدەن، لەبەر ئەوەی شتێکی گرینگ نی یه بەلایەوه.

٤ – بانگخوازێکه: بێ دەنگە لەسەر شێواز و چونیەنی داوەری و حوکمی وڵات، داوای گەرانەوەی خیلافەتی ئیسلامی ناکات، وە ناچێتە ناو ماف و ئەرکە گشتیەکانی ئوممەت.

٥ – بانگخوازێکە: کارو چالاکی و دروشمە بەندایەتیە گرینگەکانی کە جێ دەهێنێت ناچێتە دەرەوەی مزگەوت.

٦ – بانگخوزاێکە: هەڵدێت لە بەژداریە کردەیەکانی ئوممەت، وە دێـتە سەر باسی ئەو سەرگوزشتانەی کە دوورە ڕووداوەکانی ژیان و دوورە لە بایەخە گرینگەکانی موسڵمانان.

٧ – بانگخوازێکە: کە کێشەو مشتومڕو ڕاجیای زانایانی مەزهەبەکان و عەقیدەییەکان کۆنە (یەك با تۆز لەسەر نشتوەکان دەتەکێنێ و) زیندویان دەکاتەوە کە لە نێوان کۆمەڵە موسڵمانەکان رویان داوە، وە شەڕی وێران کار ڕادەگەیەنێت لەسەر (موعتەزیلە)و(جەبری)ە و(جەمهیە)کان و ئەوانەی تر کە مرووەدون هەرەسیان هێناوە و شوێنەواریان نەماوە.

٨ – بانگخوازێکە: کە بانگەشە ڕێڕەو و ڕێچکە هزریە ڕۆژیاواییەکان دەکات، وەکو دیموکراسیەت و ئازادی و مرۆڤایەتی وەموژدەی ئاشتی و سینە فراوانی دەدات.

٩ – بانگخوازێکە: سەرسامی خۆی ئاشکرادەکات لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا، وە بەرزی ژیانی ئەمریکایی، وە بۆتە پێشنگای پێشکەوتنە ماددیەکانیان، و ئەو شێوە ڕەفتارەی کەلەوێ ئەنجام دەدرێ (هەڵبەتە بە پیا هەڵدان).

١٠ – بانگخوازێکە: بەژدارە لە پێشخستن و جێبەجێ کردنی پیلانی ئەمریکی لە پێشخستنی ئیسلامی ئەمریکایی، ئامادیی هەموو بانگەشە و کۆنفراسیەکانیانە، ئامادەکەری بابەت و توێژینەوەو گوتاریەتی لەو بارەوە و ئاماژەدەری بڵاو کراوەکانیانە بۆ ئەو مەبەستە هاتونەتە مەیدان.

١١ – بانگخوازێکه: بیرو ڕای وایه که جولەکەو دیانەکان باوەڕدارن و یەکتا پەرستن، و بانگەشەی ڕێك کەوتن و هاوکاریکردنیان دەکات، و داوای بەژدارکردنی مسوڵمانان دەکات لەگەڵیان له چالاکیەکانیان.

١٢ – بانگخوازێکه: که بانگی جیهادی لابردووه، لەسەر ئەو تێڕوانینەی که ئەوه جۆرێکه له توندڕەوی و تۆقاندن، که ئیسلام دانی پێنانێت.

١٣ – بانگخوازێکه: بەرەنگاری داگیرکەر و (ئیحتلالی ولاتی موسڵمان) نابێتەوه که هاتوون ڕاووڕوت و تاڵانی شته بەنرخەکان بکەن، بەلاشیەوه (شەڕی سارد) شەری فیکرو ڕۆشەنیری دژی ئوومەت گرینگ نی یه و بێ بایەخه

١٤ – بانگخوازێکە هەموو هێز کۆششی خۆی خستۆ گەڕ بۆ شەری لایەن و بزاوتە ئیسلامیەکان، لە کاتێکدا کە بێ دەنگە لەسەر هەموو ئەو هێرشانەی لەلایەن دوژمنانەوە لەسەرمانە.

١٥ – بانگخوازێکە: سەر قاڵی کاری تایبەتی خۆیەتی، پێداگرە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ، سەرو و بونی سەروەتی دونیایەتی، لەکێبڕکێ دایە لەگەڵ هاوشانەکانی خۆی لە ناوەند کۆمپانیا ...خۆی ڕازاندۆتەوە بۆ نزیکتر بوونەوە لێیان ، جا چ پێویست ناکات بچێ بەدوای کاری دورخراو و ئازار دراو و بێ بەشکراو ستەم لێ کراوان دیسان لەبەر ئەوەی لەلای جەنابیان کاری ئەوان هیچ بایەخێکی نییە.

که دێینه باسی بانگخوازی موسڵمانی ئا بەو تایبەت مەندیانە کەوا ئەمریکا لێیان ڕازی یە، لە بەر ئەوە یە ئەوە ئیسلامێکی بەرز و شکۆداری خستۆتە بەر بەرژەوەندی مەدەنیەت و شارستانی ڕۆژئاوایی.

ئائەمە یە کە ئامانجی (پیلانی ئەمریکا بۆ گۆڕنی گوتاری ئیسلامی) ئیسلامی دەپێکێ_ کە لەئاڵقەکانی داهاتوو دێنە سەری پشتیوان بە خوا_ ڕێك کەوتووە لەگەڵ تایبەت مەندی و پێوەرە ئەکریکیە کە ، تا ئا ئەوانە بەم شێوە یە بەرزیان بکەنەوە بۆ کاری ئاینی لە ووڵاتی ئیسلامی و دایان بنێن لە مزگەوت و ناوەندە ئیسلامیەکان و باس و خواس و دەرس و دەوریان بۆ بکەنەوە، بیانکە نە مامۆستای زانکۆ و کۆلێژەکان ، تا لەسەر دەستان کۆمەڵێکی پواو و گەندڵ و ڕزیو و مت بووی واقع نەگۆڕی وەکو خۆیان بۆ پەروردە بکەن و بەهەرم بێنن.

جا مێزەر پاکەکان کە خاوەنی ئەو تایبەت مەندیانە نین ئەوانە لە ئیسلام نەگەیشتوون، بەڵکو ئەوانە بانگخوازن بۆ توندی و توندڕەوی ، ئەوانە هەڕەشەن لە سەرئیسلام و موسڵمانان، پێویستە کە دژایەتیان بکرێ و دەربکرێن و سزا بردێن، لە بەر ئەوەی ئەوانە زەرەرن بۆ ئیسلام و ئازارن بۆ موسڵمانان.

جا لێرە دەوەستین بۆ دەرخستنی (پواوی و ناتەوای ئیسلامی ئەمریکای) وە ڕوونکردنەوەی ئەوەی: ئەو ئیسلامەی کە خوای گەورە دەیەوێ هەرگیز ئیقرار لەسەر ئەو شێوازانەی ئیسلامی ئەمریکایی ناکات.

ئەم خاڵانەی خوارەوەش وەڵام و دەرخەری ئەو پواوی و ناتەواویەن بفەرموون:

## ئیسلام و دروشمی بەندایەتی:

١ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە توند بێ لەسەر دروشمە بەندایەتیەکان:

ئێمە ئینکاری گرینگی دروشمە بەندایەتیەکان ناکەین نوێژ و ڕۆژوو وزەکات و حەج ئەوانە هەمووی بنچینەی ئیسلامن، بەجێ هێنانیان پێویستیەکی حەتمییە، سوك کردنیان بەهیچ

جۆرێك دروست نییەو هەركەسێكیش بەسوكی و بێنرخی سەیریان بكات لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە ، ئیسلامیش موسڵمان هاندەدات لەسەر زۆر بەجێ هێنانی سوننەت و پێویستیەكان (واجبەكان).

بەڵام ئەوە بەتەنیا ئیسلام نی یە (تۆ بڵێ ی : عیبادەتی خۆت بكە و حەقت لەسەر هیچ نەبێ كەوەك باوە لە ناومان)، ئیسلام بەرفراوانییەكەی بێ ئەندازەیە و گشگیری هەموو بوارەكانی ژیانی تاك و كۆمەڵ و كۆمەڵگایە.

وەموسڵمانی پابەند بە جۆرێك لە ئیسلام دەبزوێ كە بزاوت و جوڵەكەی فروان و گشگیرەو لە خزمەتی ئیسلامەكەی دایە . هەموو ساتەكانی موسڵمانیش بە بەندایەتی بۆی حیسابە نەك تەنها نوێژ و رۆژوو..

## ئیسلام و ڕۆژی دوایی:

٢ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە قسەو باسو خواسی بەرفراوان بکات لە بارەی ڕۆژی دوایی و بە هەشت و دۆزەخ...

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی پایەیەکە لە پایەکانی باوەڕی موسڵمان لە گرنگی و بەهای خۆی کەم ناکەینەوە، ئیسلامەکەمان خۆی داوامان لێدەکات کە باسو یادی خۆی وە ئەوەش کە لە ناویدایە بکەین خۆشی بۆمانی ڕوون کردۆتەوە، و ئاگەداری کردووینە لەجۆرەها سزاکانی دۆزەخ و شادمانیەکانی بەهەشت نەك هەر باسێکی سەرزارەکی بەڵکو بەجۆرێکی ئاوا وەك ئەوەی بەچاوی خۆمان ببینین.

بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە دنیا پشگوێ بخەین و لە بیری بکەین، نا، کەسی باوەڕدار بە ڕۆژی دووایی دەزانێ، کە دنیا کێلگەی ئاخیرەت و دوارۆژە، وە پێویستیشە لەسەری کە چاکسازی لە دنیا بکات، وە بوەستێتەوە لەدژی ستەم کاران و بێباوەڕان، وە هاوکارو سەخەری چەوساوەو ستەم دیدەکان بێت، تا بە چاکەکاریەکەی خۆی سەرکەوتن ڵارە و لەوێ (ڕۆژی دوایی) بەدەست بێنێ.

## ئیسلام وڕەوشت بەرزی:

٣ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە تەنها بانگەشەی رەوشت بەرزی و پەروەردەی دەروون و پاکردنەوەی دڵەکان بکات.

ئەوەشتێکی راست و چاکە، بەڵام هەمووشتێك نییە، ئیسلام خۆی بنچینەو بناغەیە لە ڕەوشتی چاك و بەرزو بە پێز ، ئاراستەکانیشی کە دەمانگەیەنێت بۆ پەروەردەی دەروون و پاك کردنەوەی ئاراستەیەکی پتەو و بەهێزە کە موسڵمانی خوایی پێ دەگەیەنێت، کە لێڕاوە و کارەکانی تەنها لە پێناو خوایە.

بەڵام ئائەو موسڵمانە کە خاوەن ئەخلاق و ئیخلاصە ئیسلام بە شێوە گشتگیرەکەی خۆی وەردەگرێ نەك بەشێکی بە پڕی وبە شێکی بەقڕی وەربگرێ ، نا، ئا ئەم موسڵمانە وانییە بەڵکو سودی بۆ ئوممەت و کەڵکی بۆ نیشتیتمان هەیە، ئەو جیهاد لەدژی

دوژمنانی خوا دەکات، ئەوە وەستاوەتەوە بەرامبەر فێڵ و تەڵەکەو پیلانی ئیحتلال و داگیرکەر، نەك بڵی : کاکە من بە خراپەی ئەو ناکەم !

من خاوەنی خورەوشتی بەرزم و ئەو دەستەی پێم نەبڕدێت ماچی دەکەم!!.

(سەرنەخستنی چەوساوانیش لە ئەخلاقی بەرزدا جێی نابێتەوە)

## ئیسلام و کتێبە ئاسمانیەکان:

٤ -کیتابی (ئەهلی کیتاب ، خاوەن کتێب...): بەوانە دەوترێت کە لە ڕێگەی پێغەمبەرێکەوە پەیامێکی ئاسمانیان پێ گەیشتبێ..

ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە جولەکەو دیانەکانی خۆشبوێ و لە دڵیشەوە نابێ کینە و ڕقمان لە کارە گڵاوەکانیان هەڵسێ.

دەبێت ئەوە بزانین کە ئیسلام بانگەوازێکی جیهانیە، هەموو خەڵك بێ جیاوازی بانگ دەکات بۆ پەیوەست بوون و هاتنە ناوی، جا ئەو بانگەوازە ئاراستەی جولەکەو دیانەکانیش کراوە، هەروەکو چۆن بۆ غەیری ئەوانیش کراوە.

ئینجا کە جولەکەو دیانەکان ئەو داوایەی ئیسلامیان قەبوڵ نەکردوە بەردەوام بوون لەسەر باوەڕی ناتەواوی خۆیان

ئیسلام وازی لێهێناون و زۆری لێنەکردون بۆ ئەوەی موسڵمان بن، بەڵام بەو مەرجەی کە زیانیان بۆ ئیسلام و موسڵمانان نەبێ.

جا کە ئەوان لە پشتەوە سوڕانەوە و بوونە دوژمنی شەڕانی لە بەرامبەرموسڵمانان ، و هێرشیان کردە سەر دینەکەیان ،و لە زێد و زادیان وە دەرنان، وە بە ئاشکرا سوور بوون لەسەر قەڵاچۆیان،و دەیانەوێت بیانکەن بە کۆیلەو ماڵ و حاڵیان وێران بکەن، تەنها لەسەر ئەوەی کە موسڵمانن و لەسەر دینی خۆیانن. بێگومان کاتێك تۆ شمشێرێکت لە شوێنیکی لەشدا ئەو شوێنە خوێنی لێدێ ، بە دڵنیاییەوەش کاتێك ئیسلام زامدار دەبێت، دەبێ هەڵسێ و تیماری بیماری بکا، بۆ یە ئیسلامیش لەوکاتە دا بانگەشەی شەڕیان دەکات بەهەموو هێز و بازو یەوە، لەسەر موسڵمانانیشی پێویست دەکا ڕووەوڕو ڕویان تورەو کین لەدڵبن لەبەر ئەوەی ئەوان دوژمنی شەڕانین.

## ئیسلام و تێکەڵاوی (نێوان پیاو و ئافرەت)

٥ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە تێکەڵاوی نێوان پیاو و ژن بەرز و بە پیرۆز بنرخێنێ.

ئیسلام دەمێکە زانیویەتی کە چ پاشماوەیەکی خراپ دەرئەنجامی تێکەڵاوی ژن و پیاو(ی نامەحرمە)، بەهۆکاری لادانی ئارەزووی سروشتی پیاو بۆ لای ئافرەت و وە بەپێچەوانەوە،لە بەر ئەوە بەهیج جۆرێك تێکەڵاوی ژن و پیاوی نا مەحرەم بە پیرۆز ڕاناگرێ، بەڵکو حەرام و قەدەغەی کردوە و هەڵسانی بە تێکەڵاوی و کاربۆ کردنی بە شتێکی خراپ داناوە.

هەروەها ئیسلام بانگەشەی دەکات کە ئافرەت نابێ خۆڕازاوەو بۆن خۆش بکات بۆ پیاوی بیانی و نەناس (کوردی خۆمان دەڵێین بێگانە)،وە باوەش پیاکردن و بەتەنیامانەوە و سەیر کردنی

هەردوولا لەسەر یەکرتی حەرامە مەگەر کاتێك کە ئەبن بە حەڵالی یەکتر.

بێ گومان تێکەڵاوی ژن و پیاویش شتێکی گرنگ و پێویست نییە کە ناچاریی بێ لە وڵات و کۆمەڵگای موسڵمانان ئافرەت بکرێ بەکاڵای هەموو باڵا و ئاڵا یەك. ژیانیش دەگوزەرێ بێ ئەو تێکەڵاویە. لەو کومەڵگا یە پیاو شوێن و ئەرك ومافی خۆی هەیە کە کاری تیا بکا بۆ پێش وەچوونی کۆمەڵگا ،وە ئافرەتیش بەهەمان شێوە شوێن و ئەرك و مافی تایبەتی خۆی هەیە، هەردووکیان لەشوێنی خۆیان کاردەکەن، بە بێ هەڵخەڵەتاندن ، ئا ئەمەش هەر ئەمەش چاك و پاکترین ئارایشە بۆ تێکڕای موسڵمانان.

## ئیسلام و ئافرەت:

٦ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە بانگەشەی ئازادی ئافرەت و ڕۆڵگێڕانی بکات.

بۆ ئافرەت ڕۆڵێکی گەورەو کاریگەر هەیە کە ئیسلام ئاراستەی دەکات، وەگرنگی و بەرزی کاری بۆ دیاری دەکات، وە داوای بەرپرسیاریەتیەکی گەورەی لێدەکات، وە بەشانازی یەوە پەیامێکی بەرزی داوەتێ بۆ ژیان وژینگە، ئافرەت لە ئیسلام دا کەسێکی دڕندە و ترسناك وگیانێکی پیس و ناپاك نی یە، کەسێکی بەستراو ڕاوەسترا و نەویستراو نی یە، کەسێکی بەندی ماڵیش نی یە ئیسلام فەرمانی پێ کردبێ تەنها بۆ گۆڕ بێتە دەرەوە ، نا.

بەڵکو ئیسلام کارێکی بۆ ئافرەت داناوە کە لەگەڵ سروشتی ئەو ئافرەتە بگونجێ، ئەوشوێن کارەش کەهی ئەوە، لواوە لەگەڵ کەسایەتی ئەم، پێگەو جێگەشی لەکۆمەڵگای ئیسلامی پان و بەرین و بەرفراوان و بەرز و گوشادە.

## ئیسلام و خێرخوازی

٧ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە زۆر گرنگی بە خێرخوازی و بواری کۆمەڵایەتی بدات.

دیسان دەڵێن ئەو شتێکی گرنگە لە ئیسلام بەڵام ئەوە هەموو ئیسلام نییە.

ئیسلام پێداگری لەسەر خێرخوازی و بەخشین دەکات لە پێناوی خوا، وەبانگەشەی یارمەتی دانی هەژاران و نەداران و بێ نان و بێ نەوایان دەکات، جاڕی دەستی یارمەتی بەسەری بێ باوك و مێرد کوژرا و و بێوەژن و جەرگ سوتاوان دادێنی، بواری بەهانا هاتن و بەخشین لە ئیسلام بەرفروانترینە.

هەمان ئەو ئیسلامەشە کە ستەم بێ دادی و سنورشکاندن و لادانی حەرامی قەدەغەکردوە، هەمان ئەو ئیسلامە بانگەشەی بەرەنگاری ستەم و بارێزگاری وڵات دەکات هەمان ئەو ئیسلامە یە کە بانگەشەی وەستان لەدژی دوژمنە زۆر و زۆردارەکان و بوچ کردنەوەی فڕ و فێڵیان دژی موسڵمانان دەکات.

## ئیسلام و جیهاد

٨ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە جیهاد کورت بکاتەوە لە جیهادی نەفس و ئارەزوی شەیتان.

جا بە رەنگار بوونەوەی نەفس (خودی خراپ) و پشتگوێخستنی ئارەزوو، پێچەوانە بوون لەگەڵ شەیتان بچینەیەکی ڕەسەنی ئیسلامەتیە، هەربەمانەش موسڵمانی چاك چاكتر دەبێ، هەر ئەمانە موسڵمان بەرەو تەواوی دەبات، موسڵمانێکیش بەندەی نەفس و ئارەزووەکانی بێ کەسێکی بێ خێرە بۆ خۆی و خاو و خەڵك و خاکی.

بەڵام ئەوە جیهادی ئەکبەر نییە بەڵکو ئەوە مەرجی جیهادە گەورەکە یە (یانی کابرای موجاهید ئەگەر نەفسی خۆی باڵفتەی خڵتەی نەفس نەکردبێ ناتوانی ئەو جیهادەش بکات کە لوتکەی

هەرە بەرزی ئیسلامە)، جیهادی گەورەش خەرج کردن و بەگەڕخستنی توانایە بۆ سەرکەوتنی دینی خوا وە پابەند بوون بە دینی خوا و وە بانگەشە بۆی و موسڵمان پەروەردە کردن لەسەری

جیهادی گەورە(کبیر الاکبر)یش وەستانە لەدژی دوژمنە تەماعکارەکان، وە هۆشدارکردن و بێدارکردنەوەی گەل و ئوممەتە لە مەترسیداری ئەوان ئامادەباشییە لە دژی پیلانەکانیان، ئاراستەکردنی ڕوو بەڕووبونەوەیانە ، پاراستنی گەلە لێیان.

## ئیسلام و تۆقاندن (ئیرهاب)

٩ -ئەمریكا ئیسلامێكی دەوێ كە دژایەتی توندڕەوی و تۆقاندن بكات.

بێ گومان ئیسلام دژایەتی تونڕەوی و تیرۆرو تۆقان و دەمارگیری و ... دەكات ، بەڵام كێ یە كە ئەو چەمكانە پێناسە دەكات ..؟ بۆ ئەوەی هەركەس ئەنجامی دا ناوی توندرەو و تۆقێنێنەر و تیرۆریستی لێبنرێ ئایا ئەوە پێناسەیان دەكات یان یەهوود و ئەمریكا ..؟

ئیسلام داوا لە شوێنكەوتوانی دەكات كە پێیەوە پابەند بن و حوكمەكانی جێ بەجێ بكەن و بەردەوام بن لەسەری ، بەهیچ جۆرێ بۆ هیچ كەسێ ڕێگە نەدراوە كە كەم تەرخەمی و ئاسانكاری لە یاسا نەگۆڕەكانی بكات ، بە هەمان شێوەش ئیسلام

ڕێگە بە زیادەڕەوی و لەسنور دەرچون نادات لە جێ بەجێ کردنی دەق و حوکمەکانی .تەنانەت لە جەرگەی جەنگیش ئیسلام وێرانکاری و کوشتنی کەسانی شەڕنەکەر و ئافرەت و منداڵ و پیری حەرام کردووە.

ئەو توندڕەوی و زیادڕەوییەی ئیسلام دژایەتی دەکات ئەو توند بوون و زیادڕەویی کردنە لە جێ بەجی کردنی یاسا کە جێبەجێ کار دەردەکات لە هیدایەت و ڕێنمویی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕێبازی هاوەڵان و شوێنکەوتووان تەتەڕروفیش دەرچوونە لەدادگەری و میانڕەویی و یەکسانی هاوکێشەکان، دەرچوونە لەسوونەتەوە بەرەو داهێنراو وبیدعەت، دەرچوونە لە ئاسانەوە بۆ دژواری و سەختی ئەوانەی کە لەگەڵ ئاراستەکانی ئیسلام یەکناگرنەوە.

توندەروەی بەهیچ جۆرێك لەخواویستیدا جێی نابێتەوە، کارکردنێك بە دڵسۆزانە بۆ ئیسلام پێیناوترێت توندڕەیی، یان کە دژایەتی دوژمنان و وەڵامی هێرشیان دەدەیتەوە.

لەجێبەجێکردنێکی راستی ئیسلامیشدا نییە.

ئیسلام نەدان بەو پێناسانەی یەهود و نەصاراکان دا دەنێت کە بۆ دەمارگیری توندڕوەیی دەکەن ودەیخەنە پاڵ ئیسلام وەنە بەدیاری کردنی ئەو چەمکانەشیان، بەڵکو پشت گوێشیان دەخات ، لەبەر ئەوەی ئەوان هەرکەسێك بەتەواوی جێ بەجێ پێویستیەکانی ئیسلام و واز لەقەدەغەکراوەکان بهێنێت بە توندڕەو دەمارگیری دەزانن ، هەرکەسێك سەرڕاستانە بانگەوازی خواویستی بکات بە تیرۆریست دەیناسێنن.

## ئیسلام و دەستدرێژی کردنە سەر کەسانی تر:

١٠ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێت کە ڕژانی  خوێنی کەسانی تر حەرام بکات.

ئیسلامیش ڕژانی خوێنی کەسانی تر (یانی جگەلە موسڵمانان)ی حەرام کردووە.

بەهیچ جۆرێکیش دروست نیە دەست درێژیان بکرێتە سەر . بەڵام ئەوان کێن ..؟

ئەوان کەسانی بێ باوەڕی بێزەڕن ، ئەوانەی کە لەگەڵ موسڵمانان لەخاکیاندا ژیان بەسەر دەبەن، دەستیان درێژ نی یە لەسەر کەس، لەگەڵ موسڵمانانیش بەئاشتی دەژین و هەڵسوکەوت دەکەن ، پیلانیان لەدژ ناگێڕن ، دوژمنایەتیان ناکەن ، هاوکاری دوژمنانی موسڵمانانیش ناکەن.

ئیسلامیش خوێنی ئەم بێ باوەڕانەی حەرام کردووە ، هیچ موسڵمانێك بۆی نییە بەچاوی خراپ سەیریان بکات و بۆی نییە پەنجەی شەڕیشان بۆ درێژ بکات.

بەڵام ئەو بێ باوەڕانەی کە پلانیان پیلانە دژی موسڵمانان، دوژمنایەتیان دەکەن ، وڵاتیان داگیردەکەن و خوێنی خەڵکی بیتاوان بەهەردەر دەدەن ئیسلام لەگەڵ ئەوانە جەنگ و دژایەتی بە پێویست دەزانێ...

## ئیسلام و پێشکەوتن:

١١ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە شایانی پێشکەوتن و گۆڕانکاری بێ ، بە کوردی بەکوردتی وەك خۆی نەمێنێ.

گونجاندنی ئیسلام لەگەڵ هەموو سات و سەردەمێك مانای گۆڕانکاری نییە لە ئەسڵ و ئەساس و بنچینەو مەبدەئو یاسا جێگیرەکانی، وەیان شێوانی زاراوەکان و مەبەستەکانی نییە.

ئیسلام دەست تێوەردانی دوژمنانی لەخۆیدا پوچ دەکاتەوە جا چ لە لابردنی یاساکانی بێ یا لەشێوانی چەمکەکانی بێ یا لەلادانی مەبدەئەکانی ،وە ئەو دەستتێوەردانەش بە ئینحراف و گۆرانگاری دادەنێت بە هێنانی وشە بۆ جگە لە شوێن باسی خۆی دەزانێت

دەستهێنانی ئەمریکا و جولکەش و غەیری ئەوانیش بۆ ئیسلام .
مەگەر مەبەست پێی سوککردن و یاری پێ کردنی ئیسلام نیە ..؟!،
مەگەر مەبەست ئەوە نییە کە ئیسلامیش وەکو دینەکانی خۆیان
لێبکەن وەکو چۆن دینەکانی خۆشیان گۆڕیووە..؟! ،دوای
گۆڕانیان بەوئارەزووەی خۆیان کە ئەیانەوێ و دوایی بە
موسڵمانان بڵێن فەرموو ئەمەش ئیسلامەکەتان و شوێنی کەون.
بەڵام ناشتوانن.

ڕەسەنیەتی ئیسلامی راستەقینە: نموونەی بانگەوازییە بۆ
ئاسانکاری و دورکەونەوە لە ناهەمواری ، بانگەوازە بۆ سوود و
بەرژەوەندی خەڵك نەك بۆ گەندەڵی و شەڕەنگێزی بێ کەڵك،
نموونەی بەرزییە خەمو ئازاری سەر کۆمەڵگایە نەك هەر بۆ
موسڵمانان بەڵکو بۆ ئەوانەش کە باوەڕیان پێی نییە، بەهیچ
جۆرێك داوایەکی نییە کەجێ بەجێ نەکرێت.

## ئیسلام و ئاینەکانی تر:

١٢ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێـت کە: دینەکان یەکبخات بە ناوی دواکردنی ئازادی مرۆڤایەتی.

ئیسلام لە ناخ و مۆخی موسڵمانان‌دا ئەوە جێگیر دەکات کە ئەوان ئوممەتێکی میانرەون، ئەو ئوممەتەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە، ئا ئەو ئوممەتەی کە بۆ خەڵکی تر هاتوون ، ئائەم ئوومەتە دەبنە شایەت و خاوەن پەیامن، بانگهێشتی هەموو گەلانی تر ئەکات بۆ هاتنە ناوی و بۆ تەرکردنی گەرووی وشکیان بە سازگاری و خاوێنی ئاوی ، ئەوەی لەناو ئوومەتەکەو لەدەرەوەی ئوممەتەکە لەگەڵ پەیامی ئوممەتەکە نەگونجا بە دڵنیاییەوە لەسەر گومڕایی مایە پوچییە، تاکە دینی راستی رەها

(حەقی موتلەق) هەر تەنها ئیسلامە ، دوای حەقیش حەقۆکە نایەت بەڵکو گومڕایی دێت.

ئیسلام رێزی لە ئینسان گرتووە، وە مرۆڤایەتیشی بەرز ڕاگرتووە، دژایەتی دوورکەوتنەوەش دەکات لە ئینسانیەت، هەر ئەویشە کە مرۆڤ و مرۆڤایەتی لە ستەم و تاریکی و دڕندەیی ڕزگار کردووە

## ئیسلام و هاوکاری لەگەڵ کەسانی تر:

١٣ -ئەمریکای یەهود ، و نەصارنیەکان ، ئیسلامێکیان دەوێ کە هاوکاریان بێ لە دژایەتی تیرۆر و تۆقاندن و دەمارگیری.

ئەو یەهودە کێیە ..؟ کامە نەصرانی یە ..؟ کە دەکرێ ئیسلام و موسڵمانان لەگەڵیان رێك بکەون . کامانەن کە دەکرێ لە گەڵیان بەئاشتی لەگەڵمان دەژین و شەڕمان لەگەڵ ناکەن وڵاتمان داگیر ناکەن و بەرژەوەنیمان بۆ خۆیان نابەن ..؟ گەر وانەبوون دەکرێ و واش چاکە کە هاوکاری هەبێت.

بەڵام کاتێك کە یەهود داگیرکەری خاکی موسڵمانان و ئیسلامە و هەڵگیرسێنەری شەڕە لەسەریان ، ناکرێت موسڵمان لەگەڵیاندا رێ بکات و هاورکاریان و بەهیچ جۆرێك نابێت پێشیان رازی بێت.

تائەو کاتەی ئەوان خاك و ئاوی موسڵمانان داگیر بکەنو  بیخەنە ژێر ڕکیفی تەماعکاری و رقی خۆیانەوە.

هەر هەمان داگیری وڵاتی موسڵمانان کەوا هەڵسووکەوت لەگەڵ کەیسی تیرۆر و تۆقاندن دەکەن ، بۆ یە ئیسلامیش بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەو دوژمنە سەرسەخت و داگیرکەرانە ناسازێ بەڵکو لەسەر شوێنکەوتوانی جەنگ پێویست دەکات تا خاوەن ماف دەگاتەوە مافی خۆی. تا خاکی داگیرکرا و پیس تێچوو ئازاد دەکرێت و پاك دەبێتەوە.

## ئیسلام و ئاشتی جیهانی:

١٤ - دیسان ئەمریكا سەرزارەكی داوای ئاشتی جیهانی و سینەفراوانی مرۆڤایەتی دەكات.

ئێستا و ئەوسا و داهاتووش ئیسلام بەرێگایەكی ڕاستەقینە داوای ئاشتی جیهانی و سینە فراوانی ئینسانی كردووەو دەكات ، بەڵام بە رێگای خۆی نەك بەرێگای هەڵخەڵەتێنەرو تەلەكەبازانە و درۆزننانەی ئەمریكا.

ئاشتی جیهانیش نایەتە دی بەكردەوە تا ئەوكاتە ئیسلام فەرمان رەوا ئەبێ ، مەبدەكانی بڵاو دەكاتەوە ، ئەوانەش كە ئەمرۆ ئاشتی جیهانیان رماندووە ، داعیانی ئیسلام نین ، كە نەخاوەنی هیچ نەماون بە ڵكو خۆشیان بێ خاوەن ماونەتەوە جگە لەخوا . بەڵكو ئەوانەی كە ئاشتی جیهانیان روخاندووە ئەوا یەهود و نەصارایە

داگیرکەرانی خاك و تۆقێنەرای خەلك و بڵاوکارانی فەساد. بناغەدانەرانی شەرن لێرەو لەوێ بۆ مەبەستی مافی ناڕەوای خۆ پەسەندیان، ئەوانەی کەخاوەنی چەکی وێرانکار و مەردووم مرێنەرن. هێزدەرانی شەڕی سەخت، گەشەپێدەرانی ئیرهاب وغەرد و خیانەت.

ئائەوانە بوون بەداردەست و جاڕدەی ئاشتی لە جیهان ، خۆی لەخۆیدا دەبێ ئەوانە لەپێشدا داری لێ بسەنرێتەوە و بخرێتە سەر ئەو هەموو کاولکاریەی خراپەکاریەی کردوویانە.

ئا ئەوکاتە دڵەکان دوورن لەترس ، خەڵك نزیك ئەبێتەوە لە ئارامی و ئەرز و زەوی خواش فراوانە و جێ ی هەموومانی تیا ئەبێتەوە.

## ئیسلام و ڕێکخستنی حوکم:

١٥ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە لەمەسەلەی حوکما لەگوێی گای کەڕا خەوتبێ ، نەزانێ حاکمیەت و خیلافەت چی یە ، بۆشی نەبێ باسی هەڵبژاردنی فەرمان ڕەوا بکات.

ئیسلام دامەزێنرە و پارێزەری حوکمە ، بەگرینگیەکی تایبەت ، دەسەڵاتیش لە بنچینەی ئیسلامدا دیاری کراوە نەك لەبەشی سادە و سانەوی.

پێویستە لەسەر ئیسلام فەرمان ڕەوا دیاری بکات ، وەپێویستە موسڵمانانیش پەیمان بدەنە خەلیفەی جوامێر و دادپەروەر کە فەرمانەکانی لەشەرعی خوا هەڵئەهێنجێ، لەزەمانی نەمانی سێبەری خیلافەتەوەش (لەسەدەی بیستی ڕابردوو) وڵات و خاکی موسڵمانان هەرزان فرشراوەتە دەستی ستەمکاران و کەسی

خۆپەست و وڵات فرۆش بۆتەوە حاكم بەسەر ئەو یەك وڵاتەی كە ئێستا پارچە پارچە كراوە و رۆڵەكانیش بێ ئاگا و دەستەپاچە كراون.

بەڵێ ئیسلام خاوەن رێسای دەسەڵاتی سەربەخۆیە، سیستەمەكەشی خیلافەتە، چەندەها بنچینەو یاسای بۆ داناوە، لەچۆنیەنیەت هەڵسەوكەتی فەرماندە لەگەڵ فەرمانەكەی، لە ئەرك و مافی كارەبەدەست و مافەكانی خەڵكی..

ئەی چۆن ئەوهەموو دەسەڵاتە لە ئیسلام سەندراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا داوای ئەوەی لێدەكرێ كە بێ دەنگبێت لەمافی خۆی، ئاخر چۆن موسڵمانی تێگەیشتوو سەری بەرزی نزم دەكات بۆ دەسەڵاتی جاهیلی ..؟

## ئیسلام و (ئابووری و سیاسەت):

١٦ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە نەچێتە ناو سیاسیەت و ئابووری ماڵداری:

سیاسەت لە ئیسلامدا: بریتیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان، وەبەوەش کە ئیسلام دینێکی زیندووی ژێنەری ئەرێیی ئاراستەوان و جێگیرە ، ئاراستەی ناوەند و دامەزراو و لایەن و کەس و کەشەکان دەکات ، کەوا راستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی موسڵمانانەوە هەیە، هەر ئەبێت بناغەی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیانیشان دانابێت، چۆنیەتی جێ بەجێ کردنی ئەو سیستەمەشی دیاری کردبێت ، بۆ پاراستنی دوورکەوتنەوەی لە فێڵ و تەڵەکەو سووککردنی.

ئیسلامیش ڕێکخەری ئابووریە، بۆ ئەویش چەند یاساو ڕێساو مەرجی داناوە، بۆ ئەوەی ئابووری ئیسلامی شێوازێکی زیندووی پاکی هەبێت.

بانگەشەی بەکار خستن و گەشەسەندنی سەروەت و سامانی هاوڵاتیان دەکات ، بۆ ئەومەبەستەش ئەو زیانانەی کە ڕوو لە موڵك و ماڵ ئەکات حەرام و قەدەغەی کردووە بۆنموونە (سوو (ربیا) و قومار و فرتوفێل و دزی و بەرتیل و بازگانی حەرامکراوەکان).

ئیسلام گرنگیەکی تایبەتی بە سیاسەت و ئابووری و ماڵ داوە، حەقیقەتی ئیسلامیش ئەوەیە کە پێك هێنەر و ڕێك خەری گشگیری هەموولایەکانی ژیانە.

## ئیسلام و ڕێرەوە هزریە ڕۆژئاواییەکان:

١٧ - ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کەدان بە ڕێرە وە هزیەڕۆژئاواییەکان دابنێ وەکو دیموکراسی:..

لە ئیسلام دا تیۆرێکی تایبەتی هەیە بۆ شارستانیەتی ڕۆژئاوایی، لەسەر ئەوەی رۆژئاوا میراتگری شارستانیەتی یۆنانی و رۆمانی کۆنە، وەئەیش خاوەنی دەستکەوتی ماددی و پیشەسازی و تەنکنەلۆژیای سەرقاڵکەرە، بەردەوامیش لە پێشکەوتن دایە، وئیسلامیش رێگری ئەوە نییە سوود لەو دەستکەوت و پێشکەوتنە ماددیانە وەربگیرێت، لەگەڵ ئەوشدا موسڵمانان هاندەدات کە خۆیان خاوەنی کەرەستەی خۆیان بن.

بەڵام دەستکەوتە هزریەکانی رۆژئاوا ، وە ئەوەی ماوەتەوە لە تیۆر و رێرەوە هزریەکان، ئەوا پێویست ناکات موسڵمان وەری بگرن، لەبەر ئەوەی کاریگەرە بە بیروڕای بێ باوەڕی، وە بەجێهێنانی نەریت و خوی جاهیلی، نەریت و بەهای رۆژئاواش مرۆڤ لە سالاریەوە بەرەو لاساری دەبات و هەڵەیە ، ئیسلامیش دان بە (وجودیەت و دیموکراسی و سیکۆلاریزمی) دانانێت، لە ئیسلامدا هزر و رێڕە و بەها و تیۆری راست هەن ، ئەمانیش بەسن بۆ ئەوەی موسڵمان بەرەو بەختیاری هەتاهەتایی ببات.

## ئیسلام جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت:

١٨ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێت کە رازی بێت بە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ، دوورخستنەوەی ئیسلام لە ژیانی رۆژانە.

خوای گەورە ئیسلامی کردووە بەدینێکی تەواوی گشتگیر، بەرێکخەری هەموو کایەو یەکەکانی ژیانی موسڵمان، وە ڕازی نیە بکرێتە سیحری و دووربخرێتەوە لە ژیانی موسڵمان، وە ناشکرێ دەوڵەتێك حوکمی موسڵمانان بکات دووربێت لەو بەرنامەیەی کە بۆ رێکخستنی ژیانی خەڵك لە لایەن خوای خەڵکەوە هاتووە چونکە هەر بەمەیە دوورکەوتوینەوە لە ڕاستیەکان.

ئیسلام ئەو ئاینەیە کە دەوڵەت دادەمەزرێنێ، وەئاراستەی ئەکات، وە دەی پارێزی و چاودێری دەکات، ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە مرۆڤ لەوەوە راستیەکان بدۆزێتەوە بەرچاوی ڕۆشن ببێتەوە و راستیەکان بکاتە رابەری هەڵسوکەوتەکانی و ژیانی خۆشی پێ رێکخات ، ئیسلامیش رێکخەری ژیانی تاك و کۆمەڵە ، ناکرێ تەنها لەمزگەوتەکان بێ، یاتەنها لە ناوەندە ئیسلامیەکان بێت ، بەڵکوو دەچێتە ناو هەموو دامەزارو و ناوەند و وەزارەت و یانەکان.

ژیاتی تاك وابەستەیە بە ژیانی کۆمەڵگا ،کۆمەڵگاش وابەستەیە بەتاکەکانی ناویەوە ، بۆیە هیچ کەسێك بۆی نیە چەواشەی لێکترازانی تاك و کۆمەڵگاکەمان بەسەرابکات و دین(ئیسلام) و دەوڵەت لێك جیا بکاتەوە.

## ئیسلام و ئازادی تاك:

١٩ -ئەمریكا ئیسلامێكی دەوێت  كە دژایەتی تاوانكاری و بێ ڕەوشتی و شتی قێزەون نەكات.

ئیسلام بێدەنگ نابێت لەسەر شتی قێز و بێز لێكراو، داواش لە موسڵمانان دەكات كە دووربكەونەوە لە هەموو ئەوانەی كە خوا قەدەغەی كردوون، پێویستیشە لەسەر موسڵمانان كە كۆمەڵگاكانیان پاكبكەنەوە لەهەموو ئەو ژەهرو دەردە كوشندانەی كەواله لەمرۆڤ دەكەن یاخی بێ لە خوای گەورە ، جا چ لە قەدەغەكراوە رەوشتیەكان بێ ، یا لەكۆمەڵایەتیەكان بێ، یا لە ئابووری و سیاسی و هونەری و رۆشنبیریەكان بێت.

ئیسلام ئازادی ڕەهای نەداوە بەموسڵمانان ، نەپیاو نە ئافرەت، نەحاکم و نەمەحکوم، کەچییان پێ خۆش بێت بیکەن، بەبێ گوێدان بە هیچ بەهای باڵا ڕکێخستن و ئاراستەیەك.

ئیسلام ڕێزی لە شوێنکەوتوانی ناوە، ئازادیشی پێ بەخشیون ، بەڵام ئازادییەکی بەرپرسانەی ڕێکخراو، پابەند بە یاساو ئاراستەکانی ئیسلام ، نەبوونی ئازادی و سەربەستیش نەبوونی ژیانە ، بەڵام ئازادی بێ سنور لە قاڵبی سەربەستیەوە دەردەچێت بەرەو سەرکەشی، بۆیە ئەو ئازادیەی ئیسلام دایناوە ئازادیەکە کەس مافی براکەی ناخوات هەرکەس لە سنوری موسڵمانیەتیەکەی خۆی ئازادە ، ئەم ئازادیەشە کە ئازادبوونی لەئاگری ئەو دنیای لەدوایە و بەرەو بەختەوەری هەتا هەتایی دەمانبات.

## ئیسلام و سەرخستی چەوساوان:

٢٠ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە چاوپۆش بێ لە ئاستی ستەمدیدە چەواسەو ئازاردراوەکان ، و دەست هەڵگرێ لە ئاستی دەستی درێژی ستەمکارو چەوسێنەر و ئازاردەرەکان.

ئیسلام ڕووبەڕوی ستەمکارو تاغوتەکان دەکات ، ستەمکاری و دوژمنداریشیان لێ قەدەغە دەکات، خەڵك کردنە کۆیلەی خۆیانیان لێ حەرام دەکات، ئەمەش لە گەڵبوونی چەوساوەکان و دوورخراوەکانە، هەوڵ و هاندانیشی لەگەڵ ئەوانەیە کە رازی نەبن بە تەنگ پێ هەڵچنینی تاغوتان لە سەریان، پێشیان دەڵێ کە شکۆو رێزی ئەوانە گرینگترین شتە کە لایانە، دروست نیە شکۆی خۆیان بۆکەسانی بێ دین یان ستەمکاران بشکێنن.

ڕازی نەبوون بەزوڵم خراپەکاری و ئارەزووو پەرستی و لە ڕادەبەدەری ، ئەو واجبە کە خوای گەورە لەسەر موسڵمانی پێویست کردووە، ڕەخنە گرتن لە ستەمکار لە پێکهاتەی ئیمان بەقەدەرە کە ئەبێ دووری بخەینەوە لەسەر تاغوتی کردن ، وەهەروەها وەستان لە دژی و سەردانەواندنیش جگە لەخوا بۆ کەسی تر نیە.

## ئیسلام و واقع:

٢١ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ لەگەڵ هەموو واقیعکی موسڵماندا بگونجێ و هەرچەندە لەو پەڕی پێچەوانەیی و بێ هێزی دابێت.

بەڵێ ئیسلام لەگەڵ نەفسی ئینسان هەڵسوکەوت ئەکات، دەشزانێ کەموسڵمانان جیاوازن لە هێز و ئامادەباشی و پەیبردن و توانایان، وە دەشزانێ کەوا مرۆڤ بێ هێزوسست ئەبێت، جارجارە بێ هیممەت ئەکەوێت، و ئەکەوێتە ژێرکاریگەری ئارەزووی، ملکەچی شەهوەتی ئەبێت.

شارەزای هەموو ئەوانەیە لەبەر ئەوەی واقیعێکی هەستپێکراوە لەخودی مرۆڤدا ، بەڵام لە گەڵی دا یەکناگرێتەوە دانی پێدا نانێت و پێی رازی نیە.

ئیسلام دەیەوێ کە موسڵمان پەروەردە بکات، پاك و خاوێنی بکاتەوە، بەرزی بکاتەوە بەرەو جیهانی باڵا، وەدووری بخاتەوە لە ئارەزووو ویستی ، ئامۆژگاری ئەوەی دەکات کە جیهادی نەفسی بکات ، وەبەهێزکردنی ئیرادەوشکۆی خۆی ، سەرکەوتن بەسەر بێ هێزی و سستی و تەمبەڵی.

هەرموسڵمانێکیش هەڵوسکەوتی سەرراستە لەگەڵ ئاراستەکانی ئیسلام بکات، خوای گەورە سەرکەوتووی دەکات لە تێکۆشانەکەی، بەدەستی رەحمەتی دەستی دەگرێت بەرەو بڵندی رای دەکێشێت..

## ئیسلام و خیلافەت

٢٢ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ کە لە نەژدای خۆی خیلافەت بسڕێتەوە.

ئەمریکا و هاوڕباران و هاوڕایان و هاوڕێانی هەستیان بەگرنگی جێنشینتی هۆشیاری(خیلافەتی ڕاشیدی)بۆ موسڵمانان کردووە، خەلیفەش ئەوکەسەیە کە بە ئیسلام حوکمیان دەکات، وە حوکمی خواش لەناویاندا جێ بەجێ دەکات، نورێکی درەوشاوە ئەخاتە نێوانیانەوە، پارێزگاری لەخوێن و خاك و ماڵ و ئابڕویان دەکات، ئەوە ڕیزەکانیان یەك دەخات و بە یەکبوونی ریزەکانیان دوژمنیان پەك دەخات.

دوژمنان گرنگی خیلافەتیان بۆ موسڵمانان زانیوە، بۆیە هەموو توانایان خەرج دەکەن بۆ لابردنی خیلافەت ، بۆ ڕمانی منارەی موسڵمانان، لە پاش جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەوە، وەدابەش کردنی خاکی موسڵمانان بەسەر چەندەها دەوڵەتی شەڕکەری نێوخۆ، ملکەچ بۆ ئاراستەکانی دەوڵەتە زلهێزو داگیرکەرکانی خاچ پەرست.

ئیسلامیش بۆ موسڵمانان یاساو دەسەڵاتیکی ئیسلامی خوایی دادەمەزرێنێت، بە سیستەمە تایبەتیەکەی خۆی کە خیلافەتە، چاکترین و پاکو بەرێزترین زەمانیش کەموسڵمانان بەسەریان بردبێ، لەمەودای زەمانی خیلافەتی راشیدینی ئیسلامیەوە بووە ، موسڵمانایش هیچ کاتێك زەلیل و ژێردەست و بەهەدەردراو نەبوون تا ڕۆژی سەرکەوتنی دوژمنانیان بەلابردنی خیلافەت.

## ئیسلام و بزاوتە ئیسلامیەکان

٢٣ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێت کە دان نەنێت بە بزاوت و بزوتنەوە جیهادیەکان، ئینکاری چالاکیەکانیان بکات.

ئیسلام داوا لەموسڵمان دەکات بە سەرڕاستیەوە پابەندبن، وە بەئاگاوە تێیبگەن، وەبەهیممەتەوە پێوەی ببزوێن، وەبانگەوازی بۆ بکەن لەسەر بەرچاو ڕوونی، وە ئیسلام و زانایان و بانگخوازان و سەربازانی بەرزتر رابگرن.

وەهەروەها زانایان و بانگخوازانیش هەڵسن بەبانگهێشتی خەڵك، و ئاراستەوە پەروەردەیان بکەن، وابەستەبن بە کۆششکردن بۆ بڵاو کردنەوە بانگەوازی خواویستی و خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان.

لەو کاتەی کە ئیسلام دوورکەتۆتەوە لە ئاراستەو حوکمی ژیانی موسڵمانان، موسڵمانان بونەتە نێچیری تەماعکاران، هەڵگیرسانی بزاوتی ئیسلامی لە وڵاتانی موسڵمانان لەدوای رمانی منارەوە ، ئا ئەو بزاوت و بزوتنەوانە بە تاکو کۆمەڵیان بە ئیسلامەوە ئاراستە دەکرێن، خزمەتێکی سەرلە نوێیان گەڕاندۆتەوە و پێشکەشی موسڵمانانیان کردوە، و پەیوەستیان دەکەنەوە بەئیسلام، جیهادی ئەوان جیهادێکی پیرۆزە.

هەموو هێزەئیسلامیەکان لەشوێن و وڵاتە جیاجیاکان توشی ناهەمواروی چەندەها هەورازونشێو سەختی و دژایەتی بوونەتەوە، ئاراستەی دوژمنانی ئیسلامی ڕووەوڕوی ئەوانە، ئەوانش چەندان قوربانیان داوە و هەزارەها شەهیدیان داوە لە بچوکترین ئەندامیانە تا دەگاتە سەرکردەکانیان، بەڵام بوونیان هەرماوەتەوەو خۆشیان تا دوا دڵۆپی خوێنیان و تاکۆتا هەناسەی

حەزین و پڕ ئاواتیان بەرگری لە مافی بوونی خۆیان دەکەن، ئارامن لەسەر تاقی کردنەوکانی خوای گەورە ئەو زەبرو گورزو زەنگانەش بەدڵنیاوە بەهێزتریان دەکات لەلای خوای گەورەش بەرزتریان دەکاتەوە هەرئەوانیش سەرکەوتوون بەو مەرجەی بڕواداربن.

وە بوونی بزاوتە ئیسلامیەکانیش بەکارایی و کاریگەری دەمێنێتەوە، لەگەڵ بوونی هەموو هەلی دوژمنانیان بۆ داردەست بوون لەسەریان، ئەوەش سوونەتی خوای گەورەیە لەبەردەوامی بانگەواز، و هێزی ئەو پیاوانەی هەڵگری ئاڵان، جێگیرن لەسەر حەق وراستی، ئەوانەی پێچەوانەی کاریانن زیانیان لێ نادات، تاوەکو فەرمانی خوای گەورە دێت.

## ئیسلام و گەلان:

٢٤ -ئەمریکا ئیسلامێکی دەوێ نەزانبێ لەسەرخاوەن و کیان بوونی نەتەوەکان و ئازادی گەلان.

ئیسلام باوەشی پرسۆزو میهری بۆ هەموو گەلان ئاوالا دەکات و بیرواڕی نەتەوە پەرسیتی دەگۆڕێ بۆ خواپەرستی.

گەلان پایەیەکی تایبەتیان هەیە لەناو ئیسلام، خۆشەویستی نیشتمانیش بەندایەتی هەژماردەکات، کارکردنیش بۆ بوژانەوەو خزمەت پێی و بەرەوپێش بردنی بەشێوەیەکی چاك بەخواپەرستی دائەنرێ، وەستانیش لە دژی داگیرکەرانی بە واجب ئەزانێت.

کاتێك دوژمنان بەشێك لەخاك و نیشتیمانی موسڵمان داگیر دەکەن ( وەکو چۆن یەهود فەڵەستینی داگیرکردووە و ئەمیرکا عێراق و

ئەفغانستان و روسیا شیشان.. ) ئەوکاتە ئیسلام جیهاد فەرز ئەکات لەسەر موسڵمانان..

بەڵێ ئیسلام دژی داگیرکارێتییە ،داگیراکارانیش بەدوژمن ئەناسێنێ، هەڵسوکەوت لەگەڵیان قەدەغەیە و هاوکاریکردن و خزمەتکردنیان حەرامە..

ئیسلامی خوایی کەوا خوای گەورە بۆ پێغەمبەری ﷺ ناردووە تەنها بەو لە بەندەکانی رازی ئەبێــت ناکرێ بیکەین بە ئیسلامێکی ئەمریکایی کە ئەمریکا پێی ڕازییە، ناکرێ بەتاڵی کەینەوە لە تێگەیشتنە ئەرێیەکانی ، ناکرێ وەکو دینی ئەوانی لێبکەین ، جگەلەشێوازی خۆی بۆ هیچ کەسێك نیە دەستی چەپەڵ و رەشی تێوەردا وکوێر و کەڕو لاڵی بکات و بیکاتە دینێك

نە ببینێ و نەبیستێ نەبڵێ ، ناکرێ ببێتە دینێك کە بێ دەسەڵات لە بزاوت و ئاراستە و کاریگەری.

ئەوانەش کە هەوڵی ئەوە ئەدەن خەیاڵیان خاوە ، ئیسلامی خوایی بەهێز و ڕێزەوە ئەمێنیتەوە و ئەوان دەچنەوە بۆ زبڵدانی مێژوو، ئیسلام و جیهادمان هەر ئەمێنتێتەوە، لەسەر بەردی ڕەق هەموو شاڵاو و شەپۆڵە داگیرکاریەکان وردوخاش ئەبێت ، بەڵام ئەبێت ئێمە خاوەن ئەو ئیرادە ڕەببانیە بین کە بەئیسلام و بۆئیسلام ئەیخەینەگەر..

خوای گەورە یارمەتی دەرمان بێت بۆ جێ بەجێ کردنی دینەکەی بەو جۆرەی کە خۆی لێی ڕازییە

والحمدللهّ رب العالمين، والصلاة والسلام علَّ محمد وعلَّ اله وصحبه اجمعين ومن اهتدى بهديه الى يوم الدين

